خالید ئێرتوغرولّ

چاپی پانزدیەم

# ئەو پیاوەی

## لە دووی خۆی دەگەڕێت







**ناوی کتێب: ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت**

**نووسەر : خالید ئێرتوغرول**

**وەرگێڕ : شەیدا عەلی**

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**

**ژمارە (١١٨٩)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێ دراوە**



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا - سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 www.aramediacenter.com | info@aramediacenter.com

# پێشەکی

ئازارو نارەحەتیەکانی ساڵانی دوورو درێژی خوێندنم بە ئومێدی گەیشتنم بە ئەمڕۆ بەڕێکرد. بۆیە باش بیرم دێت ئەو ڕۆژەی یەکەم هەنگاوم نایە پیشەی مامۆستاییەوە گیانم تەژی بوو لە کۆمەڵێك هەستی جوان. بوون بە مامۆستا...وەك سەرکردەیەك کە وڵاتانێکی ڕزگارکردبێ، هەستی سەربەرزی و لەرزێکی شیرین پەیتا پەیتا هەموو گیانمی دادەپۆشی.

دەتوت لەم دنیایەدا من یەکەم کەسم کە ئەم پیشەیەم هەڵبژاردبێت، ڕێم دەکەوتە هەرکەسێك دەمپرسی:

- ئەوە مامۆستایەتی چۆنە؟

ئەو وەڵامانەی وەرمدەگرت زۆربەیان یەك شت بوون:

- مامۆستایەتی؟ پیشەیەکی زۆر جوانە بێگومان...بەڵام ئەو بەهاو ڕێزەی جارانی نەماوە.

هەندێکیش ئەوەندە بەخۆشی باسیان دەکرد، حەزم دەکرد هەر ئەو کاتە ڕاکەم بۆ قوتابخانەو تێکەڵاوی هەراو هوریای ئەو منداڵە جوانانە ببم.بەڵام کەمیش نەبوون ئەوانەی هەر کە گوێیان لە وشەی "مامۆستایی" دەبوو لچیان هەڵدەقروچکاند و بە وەڵامەکانیان خوێنمیان دەکردە سەهۆڵ، بەڵام من هەمیشە حەزم بە بیستنی شتە جوان و خۆشەکان بوو زوو وەڵامە ترسێنەرەکانم پشتگوێ دەخست.

خۆم ڕێکخست بۆ ڕۆیشتن بۆ ئەو شوێنەی لێی دامەزرابووم. لەگەڵ ئەو کۆمەڵە دۆست و خزم و خۆشەویستانەدا بووم کە هاتبوون بۆ ماڵمان تا ماڵ ئاواییم لێ بکەن. لای ئێمە عادەت وایە گەر کەسێك بڕوات بۆ شوێنێکی دوور پێی دەڵێن: "خوات لەگەڵ بێت، بە خێر بچیت و بە خێر بێیتەوە". بەم جۆرە هەم دڵنەواییت دەکەن و هەم دەیسەلمێنن کە هاوبەشی شین و شادمانین. بۆ یەکەم جاربوو هەستم بەو پاڵپشتییە دەروونییە دەکرد کە لەم نەریتە جوانەدا هەیە. ئەو شەوە قسەو باس زۆر گەرم بوو بابەتەکەش مامۆستایی بوو.. مامۆستایەکی پیری دنیادیدە، کە زۆر ڕێزم بۆ کەسێتی و زانستەکەی هەیە، باسی لە نهێنییەکانی سەرکەوتن دەکرد لەم پیشەیەدا. ئەو زانیارییانە ئەوەندە بەلامەوە گرنگبوون، خۆم بۆ نەگیرا و تاوم دایە قەڵەم و کاغەزو نووسیمنەوە.

یەکەم ئامۆژگاری: "مامۆستا، هەموو شتێکی گوندەکەیە. لە ڕاستیدا ئەمە لە ئاکاری پێغەمبەرانە، چ شتێك لە فێرکردنی ڕەوشت و زانست بەسوودترە؟ بۆیە مامۆستا گرنگە بزانێت چی دەدات بە کێ؟ کە دەیەوێت شتێکی ڕاست فێری کەسێك بکات، پێویستە نەیشکێنێت و نەیترسێنێت و هەستی بریندار نەکات. لەوانەیە بیەوێت چاکەیەك ئەنجام بدات بەڵام سەرەنجامەکەی خراپ بشکێتەوە."

دووەم: "مامۆستایەك پێچەوانەی نەریت و باوەڕی گوندییان بێت و تێکەڵاویان نەبێت و لێیان ڕابکات، هەم سەرکەوتوو نابێت وە هەم

ئاسووده نابێت له ناویاندا، بەڵکو لەوانەیە نەیشیگرنە خۆیان. دەبێت سەرەتا خەڵکی گوند هەست بە دڵسۆزی مامۆستا بکەن، ئەوسا دەرگاکانیان ئاوەڵا دەکەن و پەیوەندییەکی گەرمی لەگەڵ دەبەستن. بۆیە پێویستە مامۆستای ئەو گوندە لە پیشەکەی خۆی و زانستی دەروونناسی باش شارەزابێت، چونکە کاری مامۆستایەتی لای ئێمە تەنها فێرکردنی منداڵان نیە، بەڵکو لە هەمان کاتدا پێویستە ڕێگەچارەی گونجاوی پێبێت بۆ ئەو کێشانەی لە گونددا هەن.

سێهەم: "لە جەژنان و شایی و بۆنە جۆراوجۆرەکاندا هەموو چاوەکان بۆ مامۆستا دەگەڕێن. بێگومان پێویستە مامۆستاش ڕەچاوی ئەمانە بکات، ئەمەش داخوازی پاشخانێکی کلتوری دەوڵەمەندە، لەبەرئەوە زانیارییە تیۆرییەکانی نێو پەرتووکەکان بەس نین بۆ ئەم مەبەستە. مامۆستا لەسەرێتی ژیان وەکو قوتابخانەیەکی گەورە ببینێت و لە هەر ڕووداو و بەسەرهاتێك پەندو ئەزموون وەربگرێت و گرنگە هەموو هەڵسووکەوتێکی بە ئەندازە بێت.

چوارەم: "زانستە دینی یەکان چرای دڵن و، زانستە سرووشتییەکانیش ڕوناکی ژیرین، بە یەککگرتنی هەردووکیان ڕاستی دەردەکەوێت. قوتابی دەتوانێت بەم دوو باڵە بەرز ببێتەوەو سەرکەوتوو ببێت. گەر ئەم دوو زانستە لەیەکتری جیاببنەوە یەکەمیان دەمارگیری لێ پەیدا دەبێ و دووهەمیشیان فێڵ و گومانی

لێ چێدەبێت". ئەم وتانەی سەرەوە هی مامۆستایەکی بەڕێزە سەبارەت بە پەروەردەو فێرکردن. بە دڵ گوێم هەڵخستبوو.

پێنجەم: "قوتابخانەو مزگەوت دوو کۆڵەکە سەرەکییەکەی گوندن، بوون و ئاسوودەیی و تەبایی ئەو گوندە بەندە بە پتەویی و سەلامەتی ئەم دوو پایەیەوە، لە مزگەوتدا کەشی خواناسی، لە قوتابخانەشدا کەشی زانست باڵادەستە. یەکێکیان ڕق و دوژمنایەتی لادەبات و برایەتی دەهێنێت، ئەوی تریشیان نەفامی هەڵدەگرێت و داوەتی شارستانێتی دەکات. بەم جۆرە ئەو گوندە بە گشتی لە کەشێکی قوتابخانەییدا فێری زانست و برایەتی و پێشچوون و مەردایەتی دەبێت. ئەمانەش بە ڕابەرایەتی مەلاو مامۆستای ئەو گوندە دێتە مەیدان. "مامۆستا بەپەرگیربوون و تێکەڵاونەبوونی لەگەڵ کۆمەڵی مزگەوت، دژایەتی پیرۆزترین شوناسی گوند دەکات. ئەگەر پێشنوێژی مزگەوتیش قوتابخانە بە بێ باوەڕی دابنێت، ئەوا پزیسکی ئاشووب ئەو گوندە دەگرێتەوە. لە کاتێکدا پەیوەندییەکی گەرموگوڕی نێوان ئیمام و مامۆستا تایبەتمەندییەکە کە هەموو خەڵکی گوندی چاوەڕێی دەکەن. ئەو شەوە تا درەنگانێک دانیشتنەکەمان بەردەوام بوو کە بە تاسەو شەوقێکی زۆرەوە گوێم ڕاگرتبوو. دەفتەری ئەم تێبینییانەم خستە ناو کۆڵ و بارەکەمەوە، چونکە دەبووە مامۆستاو هاوڕێم.

## ناخۆشی و ساتە تاڵەکانی کوێخا پیرەکە

دوو کاتــژمێر بــوو بــە ڕێگــاوە بــووم. بــە درێــژایی ئــەو کاتــە یادەوەرییەکانی سیازدە ساڵی خوێندنم وەکو شریتێکی سینەمایی دەهاتە پێش چاو...لە پاش هەر تیمەنێکیش دووانەی "قوتابخانەو قوتــابی" قــوت دەبوونــەوە لــە بەردەممــدا. چــەند بیرەوەرییــەکی ڕەنگاوڕەنگ بوون خوایە!

ڕۆژانی ڕابردووم بە خـەون بیـنین بـە قوتابخانەیـەکی خنجیلانـە، ژوورێکی بچووك لە تەنیشتیدا بۆ حەوانەوە، باخچەیەك کە خەونەکانی منداڵیمی تیا بەدیبێنم، درەختێك پشتی پێوە بدەم و لـە سێبەریدا بخوێنمەوە... وە قوتابییە بچووکە نازدارەکانم و... چیتر و، چیتر...

هـەموو ئەمانـە بـا ئەندێشـەیش بـن جۆش و خرۆشێکی زۆریـان پێدەدام.

ئەی گوندییەکان؟ کە یەکەمجار مامۆستا دەبینن:

"بەخێرهاتیت کاکی مامۆستا!" بەگەرم و گوڕییەوە دەست درێژ دەکەن بۆ تەوقە. "هەر پێویستیەکت هەبوو بۆ خاتری خـوا شـەرم نەکـەیت هـا! ئـەها ئـەوە مـاڵی ئێمەیـە ئـا لـەویا!" گونـدییان زۆر میوانپەروەرن. ئەم خەیاڵە چەند جوانە! هیوا دەخاتە دڵی مرۆڤەوە و ئاسوودەی دەکات، گومانەکان ڕادەماڵێت و ئارامت دەکاتەوە.

لەوە ئەچێ بەدەم خەیاڵەوە ورتەورتم کردبێت چونکە هاوگەشتە پیرەکەی تەنیشتم بە ڕێزەوە لێی پرسیم:

- خوێندکاریت ڕۆڵە؟

- لەڕاستیدا تا دوێنێش قوتابی بووم، پیشەکەمان مامۆستاپەتییە بەڵام وا دیارە قوتابێتییش لەگەڵمان دەبێت تا خانەنشین دەبین...

- وایە تەنها مامۆستاکان قوتابی نین بەڵکو دنیا قوتابخانەیەکەو ئێمەی مرۆڤیش هەموو قوتابین تێیدا. منداڵێك کە لە دایك دەبێت ناوی لەم قوتابخانەیە تۆمار دەکرێت، ئەوەشی دەمرێت بڕوانامەکەی وەردەگرێت، بەڵام وای ئەگەر نمرەکەی باش نەبێت!

پیری دنیادیدە خەیاڵ بردیەوە وەك چۆن منیش دەکەوتمە دنیای بیرکردنەوەوە، چاوی بڕیبووە خاڵێك و داڵغەی ڕۆیشتبوو، تا دەبوو چاوانی تەڕتر دەبوون، برژانگە پێچخواردووەکانی دەوری ئەو چاوانەیان گرتبوو کە هەوری فرمێسك تێیدا سەمای دەکرد، بە دوایدا دڵۆپەکان ڕیزیان بەست و دانە دانە بە ڕیشە سپییەکەیدا هاتنە خوارەوە.

ترسام ببێتە بێڕێزی گەر هۆی ئەم گریانە بپرسم لەم پیرە ڕووشیرینە، دوای ماوەیەك کەوتەوە قسە:

- ڕۆڵەکەم! تۆش وەکو ئەو مامۆستایەی گوندی ئێمە نەبیت!

کە بینی بە شەوقەوە گوێم لێگرتووە، بەردەوام بوو:

- من سەردەمانێك کوێخای گوندەکەمان بووم بۆ ماوەی شازدە ساڵی ڕەبەق، دەوڵەمەند بووم، مەڕو ماڵاتێکی زۆرم هەبوو، بەدرێژایی دە ساڵ سێ شوان ڕانەکانمیان دەلەوەڕاند. کەمێك لە دووری دێ

کۆشکێکی دوو قاتم هەبوو، کێ بهاتایەتە گوند منی دەناسی، ژوورێکم لە تەنیشت کۆشکەکەوە تەرخانکردبوو بۆ میوان، ڕۆژێك لە دەرگایان نەدامایە دڵتەنگ دەبووم. بیرم دەکردەوە تۆ بڵێی دڵی خەڵکی گوندم نەڕەنجاندبێت وا ئەمشەو دەنگیان نەبوو؟

ئەگەر نانێکیشم دابووایە بە یەکێك دڵم خۆش دەبوو. خوای میهرەبانیش بە بەزەیی خۆی دوو هێندی بۆ دەناردمەوەو لە ماڵ و موڵکم کەمی نەدەکرد...

ئێوارەیەك کەسێکی تەمەن مامناوەند لە دەرگای داو وتی:

- من مامۆستام، هاتووم منداڵەکانتان فێری خوێندەواری بکەم.

- هەی یاخوا بەخێربێیت!

سەرمای بووبوو. زگیمان تێر کردوو لە سەروو خۆمانەوە دامانناو، وتی:

- هەژارم. کەسم نییە. باوك و دایکم کە منداڵ بووم مردوون. خێرخوازێك خستمیە بەر خوێندن. مانگێك لەمەوبەر ئەویش مرد. کەسم نەماوەتەوە لەم دنیایەدا، دەوڵەت لێرە دایمەزراندووم. منیش جانتاکەم کۆکردەوەو هانام بۆ ئێوە هێناوە. ئەگەر قبووڵی بکەن دەمەوێت لەمەولا ببنە دایك و باوکم. زۆرمان بەزەیی پیایدا هاتەوە. خێرا لەگەڵ خەڵکی گوند ماڵێکمان بۆ چاککردو کەلوپەلمان بۆ تێکردو دامانە دەستی. بەوەشەوە نەوەستاین هەموو ئێوارەیەك دەبووە میوانمان و تێرمان دەکرد.

باوەڕکە ڕۆڵەکەم، کوڕەکەی خۆم ئەوەندە خۆشنەویستبوو. چاکەکەمان هەر بەوەوە نەوەستا، کچێکی ڕەوشت بەرزو جوانمان پێدا، هەموو زەماوەندەکەشمان خستە ئەستۆی خۆمان...

کە بە سەرسووڕمانەوە سەیرمکرد، وەکو تاوانبارێك سەری داخست.

- تۆش وەکو زۆر کەسی تر تووڕە دەبیت لێم، لەوانەیە لە دڵی خۆتدا بڵێیت داخۆ کەسێك هەیە ئەوەندە ساویلکە بێت. هەر چییەك بڵێیت هەقتە ڕۆڵە... ئێمە خەڵکی ئەنادۆڵین.

نەناسراوێك، ڕێبوارێك، میوانێك، بێکەسێك لە دەرگامان بدات، دڵمان دەبێتە ئاو، گرفتی ئەو بە گرفتی خۆمان دەزانین. مامۆستاکەشمان ئەم ڕۆڵەی زۆر بە جوانی بینی و لە سەرەتاوە زۆربەمان باوەڕمان پێکرد، هەشبوو باوەڕیان پێی نەبوو. بەلام دەرفەتی ئەوانمان نەداو وتمان : "جارێ با چاوەڕێ بکەین بزانین چی دەبێت". ڕاست بکات کێشەیەك نییە، ئەگەر درۆزنیش دەرچوو قۆڵی دەگرین و دەیدەینە پۆلیس. بە چیدا بمانزانیایە کە لە پێناو ڕۆحە بە ئاژەڵبووەکەیدا دەستی لە هەموو بەها مرۆییەکان شتووە.

تا دەهات زیاتر سەرسام دەبووم، ئەو خەڵکی ئەنادۆڵە چەند بە بەزەیی و بەخشندەو خێرخوازن! نیەت پاکیو لەخۆبووردوویی بەو ڕادەیە بەرامبەر بە کەسێك کە هەر ناشیناسن... بەڕاستی مایەی سەرسوڕمانە! وتم :

- ئەی دواتر چی ڕوویدا مامە؟

دیسان چاوانی پڕبووبوونەوە لە ئەسرین، بە دەنگێکی لەرزۆك و گریاناوی وتی:

ـ جا چی نەبوو ڕۆڵە! ماڵی وێران کردم، دنیای بەسەردا ڕووخاندم. هەموو خەڵکی لادێ نازی ئەویان دەکێشا لەبەر بێکەسی و هەژارییەکەی، کەچی ئەو ڕۆژ بە ڕۆژ دەگۆڕا، هێواش هێواش نیەتە گڵاوەکەیی دەردەخست.

پەیوەندی لەگەڵ قوتابخانە پچڕی و بەسەر قوتابیەکانەوە نەدەوەستا. تا ئێوارە سەری دەنا بە سەری گەنجەکانەوەو بە بیانووی دەمەتەقێ، مێشکی دەشتنەوە. کەم و زۆر ئەو شتانەشی کە بە منداڵەکانی دەوتەوە لە قوتابخانە بە گوێمان دەگەیشتەوە.

بە مەراقەوە پرسیم: باسی چی دەکرد بۆیان ؟

ـ جا چی نا! جا چی نا! نامەردە قسەی بە ئیمان و موسوڵمانێتی وتبوو. وتبووی باوەڕی ئێوە سەقەتەو پڕوپووچە. حاشا باوەڕی بە خوا نەبوو، تۆبە خوایە تۆبە..

کە ئەمانەم بیست ڕۆژێك هێنامە تەنیشتێکەوەو پێم وت:

- بڕوانە کاکی مامۆستا. شتی ئاواو ئاوام بەرگوێ کەوتووە، ئەوەی خەڵکی دەیڵێن ڕاستە؟ ڕەنگی پەڕی و سوور هەڵگەڕا.

- حەیفت نەکرد کوێخا! قەت شتی وا دەبێت؟ هەڵبەتە منداڵەکان بەهەڵە لە قسەکانم گەیشتوون، بێگومان زانیاری هەڵەشیان داوە بە

تۆ. ئێوە دایك و باوكی ڕاستەقینەی منن، لە سایەی ئێوەدا دەژیم، ئێوە نەبوونایە من چیم كردایە؟ دواتر كوێخا، كێ دەتوانێت زماندرێژی بەرامبەر خوا بكات؟ ئەو ئێمەی لە نەبوونەوە دروستكرد. خۆشت ئاگات لێیە ڕۆژووەكانیش دەگرم. تەنانەت بە گوێرەی توانا دەچم بۆ نوێژی جومعانیش، ئیشەڵا بەتەمای پێنج فەرزەكەشم، لەماڵەوە قورئانێكیشم هەڵواسیوە، خوا كوێرم كات گەر درۆ بكەم.

هەر كاتێ دەممان بكردایەتەوە بەم جۆرە قسانە هێوری دەكردینەوە، زۆر فێڵبازبوو چاك دەیزانی لە گەڵ كێ و چۆن قسەدەكات. ڕێزی زۆری لە گەورەكان دەگرت و لەبەرچاوی ئێمە خۆی زۆر دیندار دەردەخست و، لە ژێریشەوە بە ئارەزووی خۆی لاوەكانی ئاراستە دەكرد، ئەو مێشكە كۆرپەو تازانەی پڕكردبوو لە ژەهر.

ئەم پیاوە پیرەی كە وامدەزانی هیچ نازانێت، چی دەگوت؟ وا سەرنجی ڕاكێشابووم بە هەموو گیانم گوێمگرتبوو. ئەم مامۆستایە بە نانی میللەت گەورە كراوە كەچی ناپاكی لە كەسانێك كردووە كە شایانی ڕێزێكی زۆرن. زۆر تووڕە بووبووم، بە پارەی میللەت هەوڵبدەیت بۆ ڕووخاندنی میللەت... لەمە سپڵەیی تر دەبێت چی بێت؟

هاوڕێی پیری گەشتەكەم، ڕستەكانی ناو بە ناو بە كۆكەكانی كەرت دەبوون، منیش هەوڵمدەدا لە مێشكی خۆمدا بیانلكێنم بەیەكەوەو مانایەكیان لێ دەربهێنم. ئەم میللەتە چەند مستەكۆڵە درا

لە بیروباوەڕی و حاڵی حازریش لێی دەدرێ. کە ئەمانەم بیست جارێکی تر هەستم بە گرنگی پاراستنی هاوڵاتیان کردەوەو وتەی زانایەکی پایەبەرزی ئیسلامم بیرکەوتەوە کە دەفەرموێت:

"جاران مەترسییەکان لە دەرەوە دەهاتن، بۆیە بەربەرەکانێ کردنیان ئاسان بوو. بەڵام ئێستا لە ناوەوە دێن، گورگ چۆتە ناو لاشەکەوە، بەرلێگرتنی زۆر قورس بووە. دەترسم لاشەی کۆمەڵگا زۆر بەرگەی ئەمە نەگرێت چونکە هەست بە دوژمن ناکات. ئەو کەسەی ڕەگی ژیانی دەقرتێنێت و خوێنی دەمژێت وا دەزانێت دۆستێتی."

هاوڕێ پیرەکەم بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەی سەرگوزەشتە پڕپەندەکەی:

ـ پاشان دەڕۆیشت و بۆ چەند ڕۆژێك نەدەگەڕایەوە. کە دەمانپرسی، دەیوت: " لە فلانە شوێن برادەرێکم هەیە چووم بۆ لای ئەو" یان "مامۆستای فلانە دێ بانگهێشتی کردووم" کە لێشمان دەکۆڵییەوە هەمووی پووچ و بێ بنەمابوون.

دواتر گەنجانی نەناسراو لە دێدا دەرکەوتن ڕاستیەکەی نەدەچوونە دڵەوە، چونکە جلوبەرگ و هەڵسوکوتیان زۆر جیاواز بوو.

ڕۆژێکی تریان ژنەکەی دیار نەما، کە خزمانی کچە هاتن و پرسیان، وتی:" مامم نامەیەکی بۆ ناردووم ژنەکەی زۆر نەخۆشە، ناردم ئاگایەکی لێبێت."

باوەڕیان نەدەکرد، بەس داماوانە چی بکەن! کێ بە خەیاڵیدا دێت مرۆڤ ئازاری خێزانی خۆی بدات.

ئەوانەی سەردانیان دەکرد زیاد بووبوون، بە تەواوەتی پەیوەندی بە قوتابخانەوە نەمابوو. چەند جار هات بە خەیاڵمدا شکاتی لێبکەم، بەڵام خۆم پاراستبووم، خۆم کچم دابوویە، خۆم بووبوومە خاوەنی، چۆن دەمتوانی شکاتی لێبکەم؟

لەو ماوەیەدا جووڵەیەك کەوتبووە گەنجانی گوندەوە، هەموو دەمانچەو تفەنگیان گرتبوو بە دەستەوە. جاری وا هەبوو نیوەی شەوان گوێمان لە تەقەی تفەنگ دەبوو. دوایی بۆمان دەرکەوت کە فێری بەکارهێنانی تفەنگی کردوون.

کۆتا جار کە دیار نەما ڕۆژی یەکشەممە بوو، پێنج ڕۆژ نەمانبینیەوە. کەوتبووینە مەراقەوە، ڕاستییەکەی بە تەواوەتی کەوتبووینە گومانەوە. هەواڵمان نارد بە ڕاست و بە چەپدا، شەوێکی درەنگ لە دەرگا درا. گەنجێك بە شپرزەیی قیڕاندی:

- ئەمەیە ماڵی کوێخا؟

- ئێرەیە، چیت دەوێت؟

بردمە ژوورەوە، دانەدەنیشت:

ـ مامۆستای گوندەکەتان تووشی ڕووداوی ئۆتومبێل هاتووە. خۆی و خێزانەکەی بە قورسی بریندارن، ئێستا لە نەخۆشخانەن تکای تیاکردم و وتی: "برۆ بۆ لای کوێخا، چەندی پارە هەیە با فریامان

کەوێت، ئەگەر نەشیبوو با لە خەڵکی تری قەرز بکات" هەردووکیان پێویستیان بە نەشتەرگەرییە، دکتۆرەکانیش پارەیەکی زۆریان دەوێت.

من لە شڵەژاویدا دەست و قاچم گوێی نەدەکرد، کوڕەکە وتی:

ـ نابێت کات بە فیڕۆ بدەین هەردووکیان گیانیان لە مەترسیدایە، تەکسی یەکە لە خوارەوە چاوەڕێیە.

گەنجەکە بە چاوی تەڕەوە تەماشای دەکردم، لەو کاتەدا بیرم بۆ هیچ شتێکی خراپ نەچوو، لەوانەیە دڵی نەرم بووبێت و ڕۆیشتبێت بە شوێن ژنەکەیداو لە گەڕانەوەیاندا تووشی ئەو کارەساتە هاتبن، بە پارەی ئەو وەختە (واتە ساڵی ١٩٧٩) سەد هەزار لیرە لە جزدانەکەمدا بوو، پارەی شەست مەڕ بوو. خێرا ڕامکرد بۆ لای خاڵی کچەکە، چونکە باوك و دایکی نەمابوو و خاڵی بەخێوی کردبوو.

کە پێم وت ئەو هەژارە زۆر ترسا، ئەویش سی هەزار لیرەی لەگەڵ خۆی هێنا. سێ ئاڵتوونیشی نایە باخەڵی ئەمە دنیایە نەوەك پێویستمان بێت. بەپەلە سواری تەکسی بووین و کەوتینە ڕێ. کە تۆزێك لە دێ دوورکەتینەوە کەوتمە گومانەوە، چونکە ئەو گەنجانە سەرو فەساڵیان هیچ نەدەچوو بە دڵدا. شۆفێرەکە قژدرێژێکی چڵکنی شڕۆڵە بوو، ئەو کوڕەشی کە ئێمەی بانگکردبوو چاوی سوورو ڕوخساری دڕندانەبوو، لەوە نەدەچوو زۆر بە کارەساتەکە دڵتەنگ بووبن. شەو درەنگ بوو کە دەرچووین لەبیرمچوو تفەنگێك شتێك

لەگەڵ خۆم هەڵبگرم. خۆ نەشدەکرا لەسەر ئەو شاخە سەیارەکەیان پێڕابگرم و دابەزم، ئەوەی ڕاستی بێت ترسم لێنیشتبوو. قسەکانی هاوگەشتەکەم لە فیلمێکی پڕ ڕووداو و ترسناك دەچوو، گوێمگرتبوو تا بزانم کۆتایی چیرۆکەکە بە چی دەگات. کوێخا بەردەوام بوو:

ـ کە تەکسییەکە چووە ناو دارستانەکەوە خاو بۆوە. هەستمکرد دەیەوێت بوەستێت، پرسیم:

ـ چی بوو ڕۆڵە، سەیارەکە کێشەیەکی هەیە؟

ـ لەوانەیە بەنزینەکە ئاوی تێکەڵ بووبێت. مەکینەکەی تەقەی لێوە دێت، ئێوە دانیشن ئێمە ئێستا چاکی دەکەین.

ئۆتۆمبیلەکەی وەستاندو خۆی و بێ شکڵەکە دابەزین. تەواو ترسام، بە کەلای چاو سەیرێکی چواردەوری تەکسیەکەم کرد، چی ببینم؟ کۆمەڵێك چەك بە دەست! ڕاستی بڵێم لەو کاتەدا پارەو پولم لە بیرچووبۆوەو خەمی گیانم بوو، هاوڕێکەم وەك شەقشەقە دەلەرزی.

لوولەی تفەنگەکانیان تێکردین و دایانبەزاندین، چاوو دەستمانیان بە توندی بەستەوە، پارەو ئاڵتوونەکانیان لێسەندین، چیمان لەدەست دەهات؟ لوولەی دەمانچەکانیان لەسەر پشتەملمان بوو. بجووڵاینایەتەوە بێ بەزەییانە لەوێدا ساردیان دەکردینەوە، بەزەیی و ویژدانیان تێدا نەبوو.

یەکێکیان:

ـ کوێخـا! تـا ئـەمڕۆ بەسـەر لادێییەکانـەوە دەژیایـت و لێـت دەخواردن، خۆ تووڕە نەبوویت کە تۆزێکیت لێ داوە بە ئێمە؟

بـە کورتیەکـەی کـار لـەکار ترازابـوو. بێئاگـا لـەو کارەسـاتەی سبەینێ بەسەرمان دێت، چاوەڕێی بەیانی بـووین. سوپاسـی خوامـان دەکرد کە گیانی ڕزگارکردین، چووزانم سبەینێ ئاوات بۆ مەرگی خـۆم دەخوازم. خۆزگە هەر لەویادا منیان کوشتبا!

هاوگەشتەکەم دیسان هەوری فرمێسك بەری چاوانی گـرت. لێـوە وشـکەکانی خـەمگین و تووڕەبـوون. نەیـدەتوانی بەرلـە هەنسـکە هـەڵقوڵیوەکانی نـاخی بگرێـت. وشـە و ڕسـتەکان پارچـە پارچـە لـە دەمیەوە دەهاتنە دەرەوە. مشتێکی لە کورسییەکەی بەردەمی دا:

ــ خوێڕییــە ناپاکـەکان! منتــان ســووتاند، ئیشــەڵلاَ ئێـوەش دەسووتێن.

وەك منـداڵێك ئـاهی هەڵدەکێشـاو دەیویسـت ئاگرەکـەی نـاخی خامۆشکاتەوە، دەسڕێکی چرچ و لۆچی لە گیرفـانی دەرهێنـاو چـاو و لووتی پێ سڕی.

ـ کـە گەیشـتینەوە ماڵـەوە قیامـەت هەسـتابوو، کۆمـەڵێك چەتە دابوویـان بەسـەر ماڵماندا. ماڵەکـە کەمـەکێك لـە دووری دێ بـوو. تـا ئاوایی پێیان زانیبوە، شتەکە قەومابوو. تفـەنگیان دەرهێنـابوو داوای زێڕ و پارەیان کردبوو. کـە نەشـیان دۆزیبـووەوە کـوڕە خۆشەویسـتە حەڤدە ساڵەکەم و خێزانەکـەم کـە بیسـت سـاڵ بـوو هاوسـەرم بـوو،

دڕندانه کوشتبوویان. سەیرم لێدێت کە لاشەی بە گوللە پێکراوی ئەوانم لەناو گۆمێك خوێندا بینی چۆن شێت نەبووم.

چاوم پەڕیبووە پشتی سەرم و پرسیم:

- ئەی نەگیران؟

- گیران، بەڵام بە چی دەچێت، خۆ تازە مردوو ناگەڕێتەوە.

- ئەی مامۆستاکە چی بەسەرهات؟

ئەویشیان گرت، ئێستا نازانم لە کوێیە. ژیانی ئەو کچە هەژارەشی وێران کرد. داخۆ دەبێت بۆ چ شتێکی خراپ زۆری لێکردبێت، بەرگەی نەگرتووەو خۆی هەڵواسیوە.

لەم قسانەدا بووین، سەیارەکە گەیشتە گەراجی پاسەکانی قەیسەری. من دەچووم بۆ هەتای. پیرە دەچووەوە بۆ ماردین.کە جیابووینەوە، دەستمی گوشی وتی:

- خوات لەگەڵ مامۆستا! خوای گەورە خزمەتی ئەم خاکەت بە نسیب بکات، ڕووخێنەر زۆرەو بنیاتنەر کەمە، مادەم وایە دەبێت بیناکەران شەو و ڕۆژ بخەنە سەریەك و لە کاتی خۆیدا ناشیرینییەکان چاکبکەنەوە، ئەم کارە پێویستی بە فیداکارییەو بە پارە ناکرێت، چونکە ئەزموونی ژیان تێیگەیاندین کە زۆر شت هەن لە پارە گرنگترن. چیرۆکەکەیم لەسەر دڵم نووسی و بەڕێزەوە دەستیم ماچکرد. دوای دوو کاتژمێر پێکەوەبوون بەم جۆرە جیابووینەوە.

بەڵام ئەو بەدکاریانەی هاوپیشەکەم کردبووی مێشکمی داگیرکردبوو. بە دەست خۆم نەبوو، ئەو ڕووداوە پڕپەندەم لە سەرەتاکەیەوە دەهاتەوە پێش چاو. چەند جارێکیش نەك جارو دووان، لە هەر جارێکیشیاندا دەتوت ئەو سەربوردە ترسناکە بەسەر من هاتووە..

## لە ژەهراوی کردندا چێژ وەردەگرن

لەم نیشتیمانەدا لە دایك ببیت، بە ناو و نانی ئەم خاکە گەورە ببیت، لە کۆمەڵە قوتابخانەیەکی وادا بخوێنیت کە لەوانەیە پارەکەی لە دەمی منداڵە هەتیوەکان گیرابێتەوە، ببیتە مامۆستاو بتنێرن بۆ لادێ، بچیتە ناو کەسانێك کە لە کاری مرۆڤانەو یارمەتیداندا پێشبڕکێ لەگەڵ یەکتر دەکەن، وەك کوڕێکی خۆیان مامەڵەت لەگەڵدا بکەن، کەچی تۆ هەستیت ئەم بەخششانە لەبیربکەیت و بەرد بکەیتە ئەو کانییەوە کە ئاوت لێخواردوەتەوە.

ئەمە چ تێگەیشتنێکە؟ ئەمە چ فەلسەفەیەکە؟ تەنانەت ئاژەڵێك لە بەرامبەر چاکەیەکی خاوەنەکەیدا هەزارو یەك خزمەت دەکات، کەچی ئەم نان کوێرانە هەمیشە ڕێگەی پێنەزانین هەڵدەبژێرن. چۆن ویژدانیان ڕێگەیان پێدەدات؟

بیرم دێت وەڵامی ئەمەم لە پەرتووکێکدا بەرچاو کەوتبوو، زۆر بە جوانی ڕوونی دەکاتەوە: "ئاشکرایە ئەگەر شتێکی بەنرخ و شتێکی

بێ نرخ بشێوێن و تێکبچن، شتە باش و بەنرخەکە لە شتە نرم و کەم نرخەکە زیاتر دەشێوێت و دوور دەکەوێتەوە لە سروشتی خۆی. وەك چۆن ئەگەر شیر و ماست بەسەربچن و بشێوێن، هەر بەکەڵکی خواردن دێن، بەڵام ڕۆن ناتوانرێت بخورێت، بەڵکو هەندێك جار وەك ژەهری لێدێت. بە هەمان جۆر ئەم مرۆڤەی کە بەنرخترین و بەرزترین بونەوەری ناو گەردوونە، ئەگەر لەڕێ لابدات و دەست لە مرۆڤێتی خۆی هەڵگرێت، لە ئاژەڵێکی تێکچوو لەڕێ لادەرو دڕندە زیاتر دەشێوێت و لە سروشتی خۆی دادەماڵدرێت. وەکو ئەو جڕوجانەوەرانەی لێدێت کە چێژ لە نیشتنەوە بەسەر شتی پیسەوەو تام لە ژیانی بۆگەن و قێزەون وەردەگرن، وەك چۆن مار چێژ لەپێوەدان وەردەگرێت، ئەمانیش لە زەلکاوی گومڕایی دا چێژ لە ڕەوشت و ئاکارە بەدو پیسەکانیان دەبینن و شانازیشی پێوەدەکەن، چێژ لەو ستەم و کاولکاری و خراپەکارییە دەبینن کە دەیکەن."[1]

ئەو وتانەی کە نیو سەدە لەمەو پێش وتراون ئەمڕۆ واتاکەیان بە ڕۆشنی دەردەکەوێت. ئەو تۆوانەی ئەو کاتە نێژراون، ئەمڕۆ میوە دەدەن. ئەگەر لاوانی ئەم وڵاتە باوەڕو ڕەوشت و مەردایەتی لە دڵیان هەڵ بکەندرێت، چ ئاشووب و بەڵایەك بەسەر ئەم میللەتە دەهێنن! کە بیرم لەمە دەکردەوە سەرەڕای گەرمی گەراجی قەیسەری، دەلەرزیم و داوام لە خوای مەزن دەکرد ئەم خەڵکە بێتاوانە لە شەڕی

---

١- خاوەنی ئەم چەند دێڕە مامۆستا سەعیدی نوورسی یە.

ئـەوان بپارێزێـت. بـەرەو پاسـە تازەکـەم دەڕۆیشـتم و لـە بـەردەم خۆمەوە هەوڵمدەدا وتەکانی هاوڕێ پیرەکەم دووبارەکەمەوە:

"ڕووخێنەران زۆرن و بنیاتنەران کەم، بۆیـە پێویسـتە بیناکـەران شەو و ڕۆژ بنێنە سەریەك و پردە ڕووخاوەکان چاکبکەنەوە".

## ئەو کابرایە !!

کەوتبووینـە ڕێ، لەسـەر ئـەو ڕێگایـە بـووین کـە دەگەیشـت بـە ئەدەنە. پاسەکە کەسێکی تری نەدەگرت، ئەو تۆزە فێنکییەشی پـایز لەگـەڵ خـۆی دەیهێنـا، زۆری نـەبرد هەرکـە لەسـەر کورسـییەکانمان دانیشتین، ئەو کاریگەرییەی نەما.

ڕێبوارەکان باسی ئەو کارگەیانەیان دەکرد کـە لەمبـەرو لەوبـەری ڕێگەکەدا چووبوون بە ئاسماندا، منیش سـەیری دەوروبـەرم دەکـرد. ئەنادۆڵ، تۆ زێدێکی زۆر جیاوازیت. تەماشای کوێت بکەم، خۆمی تێدا دەبینمەوە. لە جوانیە دەستکرد و هەڵبەستراوەکان بـەدووریت و، بـە سروشـتە قەشـەنگەکەت ئـاو دەکـەیت بەدڵمـدا. ئـاه ئـەنادۆڵ تـۆ دایکایەتی کێت نەکردووە ! چی دەبێت منیش لەبیرمەکە، هەتیوێك لـە دەرگاکەت دەدات. پێدەچێت شۆفێرەکە لە دووبارەکردنەوەی هـەمان کاسێت بێزاربووبێت، بۆیە داوایـەکی زۆر سـەیری ئاڕاسـتە کـردین کـە لـەوەوپێش کـەسمان شـتی وامـان نەبیسـتبوو. بڵندگۆکـەی گـرت بەدەستەوەو بانگی لێکردین:

- ڕێبوارانی بەڕێز، دەمەوێت داوایەکتان ئاراستە بکەم. هەموو کاسێتەکانمان لێدا، ئەوەندە دووبارەمان کردنەوە بێزاربووین. ئەگەر کەسێك هەیە لەناوتاندا لە گۆرانی و حەیران دەزانێت و ئارەزووی لێیە با بێتە سەر میکرۆفۆنەکە. هەم ئێمە سەرگەرم دەکات و هەم کاتەکەش دەگوزەرێت، وا نەبێت ئەم ڕێگە درێژە بە هیچ تەواو نابێت.

غەڵبەغەڵبی ناو پاسەکە نەما، زۆربەمان یەکەمجارمان بوو گوێمان لە داوایەکی وابێت. هەموو وەکو من بە سەر سوڕمانەوە سەیری چواردەوری خۆیان دەکرد، تۆ بڵێیت یەکێك هەبێت بیەوێت گۆرانی بڵێت؟ بەڕاستی گۆرانی وتن لە پاسێکداو لە بەردەم کەسانێکی نەناسراودا بوێری دەوێت و کارێکی سانانیە. هەموو زەردەخەنە لەسەر لێومان بوو چاوەڕێمان دەکرد، دەنگێکی گڕ لە کورسییەکانی دواوە هات:

- بە یارمەتیت کاکی شۆفێر من دەمەوێت ئەو داوایەتان بهێنمە جێ. هەموومان ئاوڕمان بۆ دواوە دایەوە.

بەڵی، "ئەو پیاوە" بوو. خەریك بوو سەیارەکەمان لە گەراجی قەیسەری دەکەوتەڕێ، کە ئەوپیاوە لە مارسیدسێکی ڕەش دابەزی. پیاوەکانی چواردەوری ڕێزێکی زۆریان لێدەگرت و دەتوت سەرۆك وەزیران بەڕێدەکەن. هەر ئەو کاتە سەرنجی هەموومانی ڕاکێشابوو.

زۆر بەشان و شەوکەت بوو. قاتێکی نیلی پۆشیبوو و چاویلکەیەکی ڕەشی لە چاودا بوو. گرنگییەکی زۆری دابوو بە قژە

پرچەکەیی و شانەی کردبوو. سەنگین و باوەڕی بە خۆی بوو، سمێڵی نەبوو، ڕیشی پاك لێتاشیبوو و دەموچاوی دەدرەوشایەوە. تەمەنی خۆی دەدا لە شەست ساڵ، دوو خەتی چاڵ لە ڕوومەتیەوە شۆڕبووبوونەوە بۆ چەناگەی، مت و بێدەنگ بوون و دەتوت یادگاری زۆر گرنگیان شاردۆتەوە.

ئاگام لێبوو بە درێژایی ڕێگا لەگەڵ کوڕە لاوەکەی تەنیشتیدا، کە لە کورسی یەکەی دوای منىدا دانیشتبوون، باسی ڕووداوە هەنووکەییەکانی دنیاو، ڕاڤەی کێشە سیاسی و ئابووری یەکانی دەکرد. کەسێتییەکی بەهێزو جددی هەبوو، خاوەنی توانایەکی سەرسوڕهێنەربوو لەکاتی ئاخافتندا شێوازی دەربڕینی شیرین و بەڕێز و نەرم بوو.

بەڵێ "ئەو پیاوە" هەستایە سەرپێ و مۆڵەتی لە شۆفێرەکە وەرگرت، بە پەسەندکردنی داوایەکی ئاوەها هەموو نیگاکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو.

پیاوەکە بە ناوماندا تێپەڕی و هەموو چاوەکان لەسەری بوون.کە گەیشتە لای شۆفێرەکە چاویلکە ڕەشەکانی داکەندو زەردەخەنەیەکی شیرینی بۆ کردین و بەسەر سڵاوی لێکردین. بەم ڕێزو لەسەرخۆییەی خۆشەویستی و سۆزی ڕێبوارەکانی مسۆگەرکرد.

ئاوڕی بۆ شۆفێرەکە دایەوەو وتی:

- شۆفێری بەڕێز، لە ناخی دڵمەوە سوپاست دەکەم کە ئەم هەلەت دامێ لەگەڵ ئەم کەسە بێگەرد و هۆشمەندانەدا کاتێکی خۆش بەسەر بەرم، هەوڵ دەدەم شایانی ئەم چاکەیەتانبم.

پیرەپیاو دوای پێشەکییەکی کورت، بە وزەیەك کە هەرگیز لە پیرێکی وەك ئەو چاوەڕێ ناکرێت، کەوتە گۆرانی چڕین. تەواو سەرمان سووڕمابوو. دەنگی، ئەدای، جووڵەی دەست و پەنجەی هەموومانی حەیران کردبوو. نقەمان لە خۆمان بڕیبوو و گوێمان دەگرت.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەم پیاوە کێیە. ئەگەر هونەرمەندە، بۆچی تا ئێستا نەناسراوە، ئەگەر گۆرانیبێژ نییە چۆن دەتوانێت ئەم گۆرانییە قورسانە بێخەوش و وەکو خۆی دەربهێنێتەوە؟

دواتر ئەم پرسیارەو چەندەهای ترمان لە ناوخۆمانا لەیەکتر دەکرد، کاکی شۆفێریش تەواو مەست بوو بوو بە هەموو توانای هەوڵی دەدا نەیدا لە تاسەکانی سەر ڕێگا بۆ ئەوەی کەشەکە تێکنەدات. دوای دووەم گۆرانی بووە چەپڵەڕێزان. لە کابرا دەپاڕانەوە گۆرانی تریان بۆ بڵێت. پێنج دانە، دە دانە...تا دەتوانێت، تا ماندوو دەبێت...

بەڵام ئەو سووربوو لەسەر پۆزش هێنانەوە بۆ نەوتن و زۆر بە ڕێزەوە داوای لێبوردنی دەکردو دەیویست شتەکە لە تامدا بهێڵێتەوە.

کە چەپڵەکە تەواو بوو وتی:

- بمبەخشن. دڵم زۆر بەرگەی ئەم جۆرە گۆرانییانە ناگرێت. تکام وایە بمبورن، وەك دەبینن هەناسەم سواربووە، چونکە نەخۆشی دڵم هەیەو نامەوێت شتێکی ناخۆش ڕوبدات و ئەم کاتە خۆشەتان لێ تاڵ بکەم. دوای هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵ، چووەوە سەر قسەکانی:

- گەر توانیبێتم بۆ چەند ساتێك ئێوەی هەستبەرز و هاوڕێم دڵخۆش بکەم، ئەمشەو بە ئاسوودەیی خەوم لێدەکەوێت، بەڵام ئەگەر ئارەزووتان لێبێت لە خزمەتتاندا دەمێنمەوەو نەختێك دەمەتەقێ دەکەین، چونکە کەسێك پلیکانەی تەمەنی گەیشتبێتە شەستەکان، بڕوام وایە زۆر شتی پێبێت بۆ وتن بۆ ئەو هاوڕێیانەی کە هێشتا لە بەهاری ژیانیاندان.

پیاوەکە دیسان سەرکەوتوو بوو لە کۆکردنەوەی هەموو سەرنجەکان لەسەر خۆی. هەمووشمان مەراق گرتبوویینی، ئەو پیاوەی دڵی هەموو ڕێبوارەکانی بردبووەوە، تۆزێك پێش ئێستا چەندەها بەهانەی هێنایەوە بۆ گۆرانی نەوتن، ئەی بۆچی ئێستا ئارەزووی لە قسەکردنە؟

بە وردی چاوی گێڕا بەناو سەرنشینەکانی ناو پاسەکەداو دەستی پێکرد:

- هاوڕێیان! ژیان واتە شەڕو بەربەرەکانێ. بە واتایەکی تر ژیان مەیدانی جەنگە. مرۆڤ بۆ ئەوەی بژی، لەسەرێتی ئەم شەڕە بباتەوە، بێگومان بردنەوەش بە بێ شارەزابوون لە تەکنیکەکانی شەڕ

نایەتـەدی. تەکنیکـەکانی شـەڕیش شـتانێك نـین مـرۆڤ بـە فێربـوون بتوانێت بەدەستیان بهێنێت، بەڵکو پێویستیان بە ئەزموونە. لەوانەیـە هەندێك لە ئەزموونـەکان کۆتاییەکـەیان کـۆلانێکی دەرنەچـوو بێـت و ببێتە هۆی کۆتایی هێنان بە تەمەنێك لە تافی لاویـدا. بـۆ ئـەوەی زوو بەم سەرەنجامە تاڵە نەگەین، پێویستیمان بە ئەزموونە تاقیکراوەکـان هەیە.

منیش وەکو مرۆڤێکی شەسـت سـاڵ، لـەم جەنگـەدا زۆر ژیـاوم و زۆر شت فێربووم. دەمـەوێت ئـەم ئەزموونـە بەنرخانـە لەگـەڵ ئێـوەدا بەش بکەم، کە ئێستا ئێوەش لەناوجەرگەی شەڕەکەدان. ئەگـەر ئـەم پێوەرە گرنگانەتان فێربکەم، لەم ململانێیـەدا هەڵـە کـەمتر دەکـەن و شانسێکی زۆرترتان دەبێت بۆ مانەوە لەم کێبەرکێ یەدا، لـەم شـەڕی مانەوەدا فێردەبن نەبن بە ژێر پێوە.

وریایانە وشەکانی هەڵدەبژاردو ڕستەی کاریگـەری ڕێك دەخسـت تا گومان لە دڵسۆزییەکەی نەکەین.

- هاوڕێیان، دەمەوێت بەچـەند پرسـیارێك درێـژە بـە باسـەکەمان بدەین. تەنها سێ پرسیار دەکەم، دەمەوێت ئێوەش وەڵامم بدەنەوە. پرسیاری یەکەمم: "ئایا کەسێك هەیە لە ناوتاندا بڵێت بە درێژایی ڕۆژ، واتە لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە، بە مانای وشە دڵخـۆش بـووم؟" ئـەم پرسـیارە ناوەختـە تووشـی شـۆکی کـردین، بۆچـی ئـەم پرسـیارەی دەکرد؟ دەیویست بڵێ چی و بەتەمابوو لەمەوە بگات بە چی؟

سیماکان هەموو قەلەقی و دوودڵییان پێوە دیاربوو، بۆیە کەس وەڵامی نەدایەوە.

ئەو پیاوە بەوپەڕی جدییەتەوە:

- بێشك ناتوانن وەڵامتان "بەڵێ" بێت. من پەنجا ساڵە نەموتووە بەڵێ، کەواتە ئێوەش ناتوانن.

دووەم پرسیارم:

- "ئایا کەسێك هەیە لە ناوتانا بڵێت هەموو پێداویستییەکانم دابین کردووەو داخوازی هیچ شتێکی تر نیم؟

یەکێك لە سەرنشینەکانی دواوە:

- شتی وا چۆن دەبێت قوربان، کەی پێداویستی تەواو دەبێت؟ دابینکردنیان لە کوێ و ئێمە لە کوێ؟ جا نەخوازەڵا ئەگەر ئەو وڵاتەش ئێرە بێت!

- زۆر تەواوە! کەوایە با سێهەم پرسیارم بکەم: "ئایا کەسێك هەیە لە ناوتاندا بڵێت ژیانم لە بیمەدایەو هیچ ترس و ئەندێشەیەکم نیە؟"

ڕێبوارەکان لە بەرامبەر ئەم پرسیارە سەیرو سەمەرانەدا جارێك بە سەرسوڕمانەوەو جارێك بە پێکەنینەوە سەیری یەکتریان دەکرد. بەڵام من بە پێچەوانەی ئەوانەوە تا ڕادەیەك هەستمکردبوو ئاقاری باسەکە بەرەو کوێ دەچێت، بۆیە بێتاقەت بووبووم. ئەو پیاوە سەرەتا بە دەنگە خۆشەکەیی و قسە شیرینەکانی زەمینەیەکی باشی

ئامادەکردو نمرەی تەواوی لەلایەن ڕێبوارەکانەوە پێدراو دۆستایەتی ئەوانی بەدەست هێنا. پاشان ئەو گفتوگۆیەی بەباشی بەکارهێنا و لە ڕێگەی خاڵی لاوازی ئەوانەوە کۆمەڵێ ئامانجی خەیاڵیی بۆ دیاری دەکردن، هەموو ئەمانە گومانی منیان زیاتر کردبوو. لە کۆتایی دا وتی: "ئێوە ناتوانن بە بەڵێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە، چونکە ئێوە لەو ڕژێم و دەسەڵاتە بێبەشن کە ئەم پرسیارانە لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵدەکەنێت." بەمە بۆم دەرکەوت دەیەوێت بڵێ چی، کەوایە گومانەکەم لە شوێنی خۆیدا بوو. ئەوەندە زیرەکانە نموونەی لەسەر هەژاری و سووکایەتی پێکران و کەوتنە ژێرپێ دەهێنایەوە، کەم کەس لەو پاسەدا هەستی بەوە دەکرد کە ئەو پیاوە خەریکی پڕوپاگەندەی کۆمیونیزمە.

قسەکانی بە نوکتەو نموونەی هزرجوڵێنەر دەڕازاندەوەو خۆی لە قسەی ڕاستەوخۆ دەدزییەوەو لە پشتی پەردەوە وەستایانە ئەو پەیامەی کە دەیویست دەیگەیاند.

ئەوانەی کە لەمە ئاگادار نەبوون حەیران گوێیان بۆ هەڵخستبوو:

- بەخوا جوان قسە دەکات...
- نموونەکانی ڕێك دەیپێکێت ها!
- چاوەکەم وتاربێژێکە بۆ خۆی...
- هەر ئەوەش نا، دەروونناسی مرۆڤیشی بە خواردن خواردووە!

- پیت بە پیتی قسەکانی ڕاستە...

- پرۆفیسۆرە بابە...

- کورە زیاتریش...

"ئەو پیاوە" لێزانانە جارێك ئایەت و فەرموودە و جارێکیش دەستەواژەی ئینگلیزی و عەرەبی دەترنجاندە قسەکانیەوە. ڕێبوارەکان دەیانچرپاند بە گوێی یەکدا: "مەگەر عالمیشە نەمانزانیبوو، مەلایە چاوە ڕاستەکەم، کە وتت مامۆستای ئاینی ئەبێ ئاوا بێت".

ئەو پیاوە هەم بە ئامارەی ناڕاستەوخۆ و هەم بەئاشکرا بەرگری لە بۆچوونی"سەرپێچیکردنی هەموو یاساکان" دەکرد. چی چاکە و جوانی هەبوو لە دنیادا دەیدایە پاڵ کۆمیونیزم.

دەمویست بەرپەرچی بدەمەوە بەڵام ئەمە نەدەکرا، چونکە ئەو پیاوە خۆشەویستی خەڵکی ناو پاسەکەی بەدەست هێنابوو و دەمزانی ناتوانم بگەم بەوەی کە دەمەوێت. ئەگەر ئێستا من لەناو ئەم خەڵکەدا کە هەندێکیان وادەزانن ئەو پیاوە کەسێکی دیندارەو ئەوەی دەیڵێت موویەك لە دین لای نەداوەو هەندێکیشیان کە هیچی لێ تێنەدەگەیشتن و وایان دەزانی تەنها شەویلکەی خۆی هیلاك دەکات، هەستمە سەرپێ و ڕەخنەبگرم چی لە مەسەلەکە دەگۆڕێت؟

تێفکریم...یەکەم کاردانەوە لە لایەن ڕێبوارەکانەوە دەبێت چونکە ئەم دەمەتەقێ خۆشەم پێبڕیون. پاشان تێگەیشتبووم کە ئەو

پیاوه بەهرەیەکی وای هەیە دەتوانێت باسەکە بەرەو ئاڕاستەیەکی تر ببات و ڕاستییەکی ڕوون بشێوێنێت و وەك هەڵە نیشانی بدات. دەمزانی کە ئەگەر ڕەخنەکەم لەبەرچاوی ڕێبوارەکاندا شێوەی موناقەشە وەربگرێت، جگە لەوەی کە ناگەم بە ئامانجەکەم، ئەو ڕاستییەش لەکەدار دەکەم کە دەمەوێت بیگەیەنم.

بەڵام هەر دەبووایە شتێکم بکردایە. دوو سێ جار دەستم هەڵبڕی و ویستم مۆڵەتی قسەکردن وەرگرم. دەیبینیم، کەچی سووربوو لەسەر ئەوەی خۆی وا دەرخات کە نامبینێت. ئەگەر خۆشم هەڵقورتاندایە تووڕەم دەکردن و هەموو شتێکم تێکدەدا، خۆ ئەمەش وەك ئەوە وایە هەر لە سەرەتاوە دۆڕاندن قبووڵ بکەیت. "ئەو پیاوە" بە هەیەجانێکی زۆرەوە نزیکەی دوو سەعات قسەی کرد و ژەهری دەڕشتە ئەو مێشکە ساف و پاکانەوە کە سەرسامانە گوێیان ڕادێرابوو. حەیرانی بوێری و دڵسۆزی ئەو پیاوە بووبووم بەرامبەر بە پەیامەکەی. بەڕاستی شتێکی باوەڕپێنەکراو بوو. ئەو بەو تەمەنەیەوە ئەوەندە ڕاستگۆ بێت بۆپەیامێك کە لە ڕاستیدا فشەڵە و بۆشە، ئەی دەبێ ئەوانەی دڵیان دابێت بە بانگەوازێك کە هیچ گومانێك لە ڕاستییەکەیدا نییە، چی بکەن؟

ئەو شێوازەی ئەو پیاوە بەکاریدەهێنا زۆر سەرنجڕاکێش و تایبەت بوو بە خۆی. بە ئاشکرا لە قسەکانیدا دەبینرا کە لە فەلسەفەکەی خۆیدا قووڵ بۆتەوەو زانستێکی پڕی پێیە لەو بوارەدا.

ئەو ڕووداوانەی لە داهاتوودا ڕوویاندا ڕاستی ئەم پێشبینییەمیان سەلماند.

زانینی لایەنی دەروونی مرۆڤ بەو باشییەو، توانای دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ بەرامبەردا بەو بێوێنەییەو، هونەری کاریگەر بوون لەسەر خەڵکی بەو ئەندازەیەو، بە هیچ دانانی هەموو ئەو مەترسییە گیانی و ئاسایشیانەی کە زۆر دوور نییە بێنە ڕێی لەپێناو بەرگریکردن لە بیروباوەڕەکەی، هەموو ئەمانە جێی سەرسوڕمان بوون. هەرگیز لەبیرم ناچێت چۆن کۆتایی بە قسەکانی هێنا:

- هیوام وایە و دەخوازم وە ئامۆژگاریتان دەکەم کە: ئەوانەی باسمکرد با ببێتە پێودانگتان لەم شەڕی مانەوەیەدا. هەوڵمدا ئەو ئامانجانەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە دەتانەوێت پێی بگەن. بەرەو ئەو ئامانجە بڕۆن، بەشوێن ئەو دونیایەدا بگەڕێن، کە ئەوێتان دۆزییەوە وەڵامتان بۆ ئەو پرسیارانەی کردم، دەبێتە "بەڵێ". بە چەپڵەڕێزان ڕەوانەی شوێنەکەی خۆی کرایەوە.

پاسەکە پڕبووبوو لە دەنگی ئەوانەی سوپاسیان دەکرد.

## دەست پێکردنی گفتوگۆ لە شاخەکانی تۆڕۆس

پاسەکەمان هەڵزنابوو بە شاخەکانی تۆڕۆسداو ئێمەش چاوەڕێی ئەوە بووین لابدات بۆ نوێژی نیوەڕۆ کە خەریکبوو کاتەکەی بەسەردەچوو. کە زانیم شۆفێرەکە بەتەما نیە بوەستێت، هەستامە

سەرپێ، بە نیازبووم بە شۆفێرەکە بڵێم کە دەمەوێت نوێژ بکەم و ئایا لەو نزیکانە دەوەستێت یان نا.

هێشتا یەك دوو هەنگاوم بەرەو شۆفێرەکە نەنابوو کە گوێمان لە زرمەیەکی زۆر گەورە بوو لە دوامانەوە. سەرنشینەکان لەترسا چوون بە حەواداو هەستانە سەرپێ. پاسەکە وەستاو گشتمان خۆمان فرێدایە خوارەوە. تومەز تایەکانی دواوەی پاسەکە تەقیبوون، هەردووکیشیان بە جارێ...

شۆفێرەکە واقی ورمابوو دەیوت: "وەڵڵا پانزە ساڵە من ئەم کارە دەکەم، ئەمە یەکەمجارمە ببینم دوو تایەی دواوەی سەیارەیەك بەیەکەوە بتەقێن، خێرەبێت ئیشەڵڵا، دیارە زۆرمان گیردەدات."

ساڵانێك دواتر کە ئەم ڕووداوەم بۆ بەڕێزێك گێڕایەوە، وتی: "باشتر کە تەقیوە، تایەکانیش بەرگەی ئەو بێ باوەڕییە زۆرەیان نەگرتووە کە لەناو ئەو پاسەدا بووە!"

زۆربەی ڕێبوارەکان بڵاوبوونەوە بە سەوزاییە قەشەنگەکەی تۆڕۆسداو منیش چووم بۆ سەر کانییەکی پاك و ساردی ئەو ناوە بۆ دەستنوێژ گرتن، کە لە ژێر دارسنەوبەرەکانەوە هەڵدەقوڵا. پڕ بە سییەکانم هەوای بێگەردی دارستانم هەڵدەمژی و دیمەنی جوانی شاخەکان مەستی کردبووم، دەتوت هەموو شتێك بەدەنگی بەرز باسی تواناو میهرەبانی خواوەند دەکات.

دوای نوێژ بەدوای ئەو پیاوەدا گەڕام، تۆزێك لەولاترەوە پاڵی دابوو بە دارسنەوبەرێکی گەورەوەو پشووی دەدا. لەڕووخساریدا چێژی خزمەت کردن بە پەیامەکەی دەخوێندرایەوە، نەك ماندوێتی.

لێی نزیك بوومەوەو سڵاوم لێکرد، بە گەرمی و لەدڵەوە سەلامەکەمی سەندەوە و تاشە بەردێکی گەورەی نیشاندام و وتی: "فەرموو دانیشە."

لە بەرامبەری یەکتردا دانیشتین، زەردەخەنە میوانی سەر لێوی بوو و بە نیگا پاراوەکانی تەماشای دەکردم. دەیویست وەکو هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی خۆی نیشانی بەرامبەرەکەی بدات، بەڕاستی زۆر وەستا بوو لەم کارەیدا.

ویستم شتێك بڵێم کەچی پێش من کەوتە خۆی و ناو و پیشەکەمی پرسی، کە زانی مامۆستام زۆری پێ خۆش بوو:

ـ ئای چەند جوانە! هەموو ژیانم ئاواتم بۆ ئەو پیشەیە خواستووە، باوەڕکە مامۆستا، ئەگەر جارێکیتر بهاتمایەتەوە دنیا، مامۆستایەتیم هەڵدەبژارد، بەتایبەتی مامۆستای سەرەتایی... باشترین ڕێگەیە بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەیەك لەو ئازارانەی پێوەی گیرۆدە بووەو دەتوانیت نەوەی نوێ بۆ کوێ پێت خۆشبێت بدەیتەبەر، چونکە تۆ کار لەسەر بناغەکە دەکەیت. بینای ئەو وڵاتە لەسەر ئەو بناغەیە هەڵدەچنرێت. تێدەگەیت خۆ؟ بەم جۆرە دەتوانیت مرۆڤێکی تازە بەدیبهێنیت.

قسـەكانی زۆر ڕاسـت بـوون. دەیویسـت بـە پیاهەڵدانـەكانی ڕامكێشێتە ناو موناقەشەی ئەو بابەتەوە كە خۆی دەیـەوێت و پاشـان خۆیم بەسەردا بسەپێنێت، هەستم بەمە دەكرد.

هەڵیكم قۆستەوەو قسەكەیم پێبڕی:

ـ بـەڕێزم، هـۆی ئـەم هاتنـەی مـن پەیوەنـدی بـە وتـەكانی بەڕێزتانەوە هەیە كـە لـەناو پاسـەكەدا كردتـان. بـە وتارەكـەتان، كـە زیـاتر لـە دوو كاتـژمێری خایانـد، هـەموومانت سەرسـام كـرد. وەكـو دەروونناسـێك و ڕۆشـنبیرێك ئامـاژەتـان بـۆ كێشـەكانی ڕۆژگـار كـرد، چەند ڕێگایەكت نیشان داین كـە برینـە خوێناوییـەكانمانی پـێ سـاڕێژ بكەین.

بـەوردی گـوێم لـە وتـەكانتان گـرت، بینـیم زیـاتر لەسـەر پرسـە ئابووری و سیاسییەكان و هەندێك بابـەتی فەلسـەفی چڕ بوونەتـەوە. ماركسـیزم و كۆمۆنیزمیشـتان وەك ڕێگەچـارە پێشـكەش كـرد. بەتایبـەتی سـەلماندتان كـە لـە بـیری ماركسـیزمدا زۆر بـەتوانا و لێهـاتوون. هەڵبەتـە هەسـتم بـەوە كـرد كـە پێویسـتە لـە مرۆڤێكـی فرەڕەهەندی وەك جەنابتان، سوود وەربگرم. بۆیە ئێستا هاتوومەتـە خزمەتتان.

پێدەچوو "ئـەو پیـاوە"ی بەرامبـەرم ئـەم پیاهەڵدانـەی بـەدڵ بوبێت، بۆیە سەری لێ نزیك كردمەوەو وتی:

ـ مامۆستای لاو، زۆر خۆشحاڵ دەبم گەر بتوانم یارمەتییەکت بدەم. ئەگەر دەتەوێت سەبارەت بە بابەتێك ڕوونکردنەوە بدەم، شەرم مەکەن بپرسن. هەگبەی زانستم بۆ مامۆستایەکی وەك ئێوە، کە داهاتووی ئەم وڵاتە بەدەست ئێوەیە، نەك جارێك، هەزار جار ڕادەخەم.

ئەوەی ڕاستی بێت چاوەڕێی پەیوەندییەکی وا گەرم و گوڕ نەبووم، دەمویست "ئەو پیاوە" ڕاکێشمە ناو باسە ئیمانییەکانەوە، چونکە دەمزانی مارکسیستێکی چاوکراوەیەو شێری مەیدانی بوارەکەی خۆیەتی. ئەگەرچی لە قسەکانیدا ئایەت و فەرموودەی بەنموونە هێنایەوە، بە ئاشکرا دیاربوو کە باوەڕی پێیان نییە، بەڵکو تەنها دەیویست سوود لە هەستی ئایینی بەرامبەرەکانی وەربگرێت.

هەستم دەکرد ئەو پیاوە بۆشاییەکی گەورە لە باوەڕیدا هەیە. بۆیە پێویستبوو سەرەتا بوونی خواو پاشان مەسەلە ئیمانییەکانی تری بە بەڵگەی عەقڵی و زانستی بۆ بسەلمێنم. دواتر بابەتە فەلسەفی و ئابوورییەکان دەتوانران باسبکرێن، چونکە باسکردنی خواو قورئان بۆ یەکێك کە باوەڕی نییە، هیچ ئەنجامێکی نەدەبوو.

ڕووم کردە "ئەو پیاوە"ی کە داوای لێکردبووم پرسیارەکەم بکەم و وتم:

ـ ئەوەندەی من تێگەیشتبم، ئێوە باسی کێشەی ناو بازنە دوورەکانتان کرد وەکو کێشە مرۆیی و ئابووری و فەلسەفییەکان و

چارەسەرەکانیان...بەڵام من دەمەوێت سەرەتا لە شتە نزیکەکانەوە دەست پێبکەم، بۆ نموونە دەمەوێت خۆم بناسم و لەو نهێنییە ئاشکرا و پەنهانانە شارەزابم کە ماهییەتم (چییەتیم) هەڵیگرتووە. چەندەها ساڵە ئەم بابەتە لە مێشکمدا دێت و دەچێت. ڕاستیەکەی نەگەیشتووم بە وەڵامێکی ڕوون و باوەڕپێکراو.

من دەمەوێت لە خۆمەوە دەست پێبکەم. بە ڕای ئێوە مرۆڤ چییە؟ چییەتی و نهێنییەکانی ئاماژە بە چی دەکەن؟ ئەم نەزانراوە گەورەیە، کە تا ئێستا سەرمان لە لایەنە نادیارەکانی دەرنەکردووە، کاری چییە؟ بوونی مرۆڤ لەسەر چی بەندە؟ ساڵانێکی دوور و درێژە ئەم پرسیارانە سەراسیمەیان کردووم و ناتوانم لێیان دەربازبم، تکادەکەم یامەتییەکم بدەن، چونکە باوەڕناکەم جارێکی تر ڕێم بکەوێتەوە کەسێکی زانای وەك جەنابتان. پیاوەکەی بەرامبەرم لەپرێکدا شێلگیرانە گۆڕا، بۆ ساتێك ڕووناکی نیگاکانی پرتەیان نەماو مت بوون، دیاربوو چاوەڕێی پرسیارێکی وا نەبوو. دوای ماوەیەك:

- ئەوەی ڕاستی بێت تا ئەمڕۆ بەجددی بیرم لە مەسەلەیەکی وا نەکردۆتەوە، تۆ دەڵێیت چی؟ بە ڕای تۆ مرۆڤ چیە؟

ئاهێکم بەبەرا هاتەوە کە بینیم ڕامکێشاوەتە ناو ئەو بابەتەی کە خۆم دەمەوێت. بەردەوام بووم:

– بەگوێرەی توانای خۆم کەوتمە لێکۆڵینەوە سەبارەت بەم پرسیارانە. مەسەلەکەشم بۆ دۆستێکی نزیکم باسکرد کە زۆر متمانەم

بە ڕووناكبیری و زانستەكەی هەیە. پەڕتووكێكی دابوومێ سوودی لێوەربگرم، بەڕاستی چەند باسێكی گرنگی لە خۆگرتووە، بەڵام زمانەكەی كەمێك گرانەو لە زۆربەی تێنەگەیشتم. ئێوە لە كەسێكی ڕۆشنبیر دەچن، ئەگەر هەندێكت لەو كتێبە بۆ بخوێنمەوە، دەتوانیت بۆم ڕوون بكەیتەوە؟

- زۆر ئاساییە مامۆستا! ئەگەر ئێستا كتێبەكەت پێیە بفەرموو، چەندێك لەدەستم بێت هەوڵ دەدەم یارمەتیتان بدەم، هەم من و هەم تۆش شتێك فێردەبین.

لە گیرفانی ناوەوەی چاكەتەكەمدا كتێبەكەم دەرهێنا، كتێبەكە ناوی "پەیامی میوە"[1] بوو. "باسی شەشەم"م كردەوە.

## ئەبێ لەسەرەتادا باسی بڕوابوون بەخودای بۆ بكەم

لە بەرامبەرمدا پیاوێكی ڕۆشنیر دانیشتبوو كە هەموو ژیانی بۆ كۆمیونیزم تەرخان كردبوو. "ئەو پیاوە" نوێنەرایەتی ئەو بانگەشەیەی دەكردو منیش لاوازییەكەمم كردبووە نزاكارو لە ناخی دڵمەوە لە خواوەند دەپاڕامەوە كە ئیمان سەرخات بەسەر ئەو بیرو بۆچوونەدا.

"باسی شەشەم"ی ئەو كتێبەی بەدەستمەوە بوو، باسی باوەڕ بە خوای دەكرد. لەم بەشەدا بوون و یەكتایی خودا بە بەڵگەی عەقڵی

---

١- پەیامی میوە یان پەیامی بەری درەختی ئیمان، یەكێكە لەو پەیامانەی كە نووسەر و زانای گەورەی كورد مامۆستا سەعیدی نوورسی دایناوە.

و لـۆژیکی و زانسـتی ڕوون دەکرایـەوە. سـەرەتا پێویسـت بـوو ئـەم بابەتەی بۆ باس بکەم، چونکە باوەڕ بە خوا بناغەیەو ئەگەر بگات بـە ڕوونـی، ئـەوا مەسـەلەکانی تـر زۆر بـە ئاسـانی خۆیـان دەدەن بەدەستەوە، دەبوو خۆم وا دەرخستایە کە لە پەڕتووکە تێناگەم و بێگانـەم بـەو شـتانەی کـە تێیـدا نووسـراوە، چـونکە ئەگـەر خـۆم وا دەرخەم کە شتێك دەزانم، دەترسـام وەکـو موناقەشـەی لێبێـت. لـە کاتێکدا کە دەبوو وا دەربکەوتمایە کە دەمـەوێت هەنـدێك شـتی لێـوە فێرببم.

کەوتمە خوێندنەوەی "باسی شەشەم" کە چەند نموونەیـەکی زۆر بەنرخی تێدایە سەبارەت بە بوونی خوای گەورە:

"هـەروەك هـەر شووشـە دەرمـان و پێکهاتەیـەکی کیمیـایی نـاو دەرمانخانەیـەکی گـەورە، کـە بەچـەندین تـەرازووی سـەرنەکەر و ئەنـدازەی ورد ئاوێتـەی یـەکتر کـرابێتن، دەیچەسـپێنێت کـە دەرمانگەرێکی دانـاو کیمیاگـەرێکی زانـا ئـەم کارانـەی ئـەنجام داوە.. دەرمانخانـەی گـۆی زەویـش، کـە چوارسـەد هـەزار جـۆری ڕووەك و زینـدەوەری زیـاتر تێدایـە، بەهـەمان جـۆرە.. چـونکە لـە ڕاسـتیدا هەریەکـە لـەو ڕووەك و زیندەوەرانـە وەك شووشـەیەکی پـڕ لـە پێکهاتووی ورد و، ئاوێتەکراوێکی زیندەکاری سەر سوڕهێنەر وایە.

جا ئەم دەرمانخانە گەورەیە، خواوەندی داناو شکۆمەند پیشـانی هـەموو کەسێك، تەنانـەت کوێرەکـانیش دەدات و بەئەنـدازەی پلـەی

کەماڵە ڕێکوپێکی و گەورەیی یەکەی، بەدیهێنەری بەخشندە بە غەیری خۆی دەناسێنێت، بە چەشنی دەرمانخانەکەی بازاڕ، کە کیمیاگەرو دروستکەری خۆی ناساند. ئەمەش بە پێی زانستی "پزیشکی" کە خۆتان دەیخوێنن.

کە تەواو بوو لێم پرسی:

- ئەم نموونەیە دەیەوێت بڵێ چی قوربان؟ دەتوانیت بۆم ڕوون بکەیتەوە؟

چاوەکانی بریبووە خاڵێك و دەتوت شتێك دەبینێت کە تا ئەو کاتە نەیدیوە، وشەکان یەك یەك لە دەمی دەهاتنە دەرەوە:

- واتە هەتوانێکی ژیانبەخش و شیفابەخش دەریدەخات کە لە لایەن کیمیاگەرێکی لێهاتووەوە دروستکراوە. هاتنە بوونی دەرمانێك بەبێ وەستایەك یان دەرمانسازێك مەحاڵە، گۆی زەویش وەکو دەرمانگەیەکی گەورەترو نایابتر وایە، زەویش کە پتر لە چوارسەد هەزار جۆری ڕووەك و زیندەوەر لەخۆ دەگرێت، وەکو دەرمانەکان، داخوازی کیمیاگەرێکی بەتوانایە.

ئەگەر دەرمانەکانی ناو دەمانخانەکە کیمیاگەرێك دروستیان بکات، بە هەمان جۆر ئەم دەرمانگە مەزنەش کە گۆی زەوییە، پێویستی بە دەمانگەرێك یان کیمیاگەرێك هەیە، کە ئەویش خوایە.

پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە دەستی ڕاستی دا بە دەستی چەپیداو وەك بڵێی لە یەکێکی ترەوە گوێی لێبووە، وتی:

– بەڕاستی نموونەیەکی بێوێنەیە، ئۆریجینالە، زۆر بەرزە!

کە سەیری دەموچاویم کرد بۆ ئەوەی بزانم تا چەندێك کاریگەری هەبووەو ئەو قسانەی کە دەیکات بە ڕاستێتی یان نا، بینیم لە دڵیەوەیەتی. لە شڵەژاوی و خۆشیدا، گوێم لە دەنگی ترپەکانی دڵم بوو.

ئەو باسە چوار نموونەی تری تێدابوو، بۆیە لێم پرسی:

- بەڕێزم، ئەم باسە نموونەی تریشی تێدایە، دەتوانم بەردەوام بم؟ بە جددیەت و سەنگینییەکەوە کە تایبەت بوو بە خۆی:

- بفەرموون مامۆستا، تکایە بەردەوامبن.

بە هەزار حاڵ هەیەجانەکەمم دەشاردەوە. "ئەو پیاوە" پاش هەموو ڕوونکردنەوەیەك کە دەربارەی نموونەکان دەیدان، لەبەر خۆیەوە دەیوت: "زۆر زۆر جوانە، ڕاستی گەلێکن کە تا ئێستا نەمبیستوون". بە تایبەتی ئەم نموونەیە زۆر سەرنجی ڕاکێشابوو:

"وا دابنێ کە ملیۆنان گڵۆپی کارەبا لە ناو شارێکی سەرسووڕهێنەردا، بە بێ ئەوەی سووتەمەنییان لێبڕێت و بکوژێنەوە، هاتوچۆ بکەن. ئایا ئەم کارە -لەگەڵ دەربڕینی ڕێز و سەرسوڕماندا- دەریناخات کە: ئەندازیارێکی بێهاوتاو کارەباچییەکی کارامە هەیە، کارگەی کارەباکە و ئەو گڵۆپانەی لە ژێر دەستایە؟ بە هەمان جۆر، گڵۆپی ئەو ئەستێرانەش کە بە بنمیچی خانەی زەوییەوە شۆڕبوونەتەوەو، بە پێی گەردووناسی نوێ هەندێکیان بە هەزاران

جار له گۆی زەوی گەورەترن و، خێراییيان لە هی تـۆپی تۆپخانـەکان زیاترەو، بێ ئەوەی ڕێسای نێوانیان تێکبچێت و لە یەکتر بدەن و، بـێ کوژانـەوەو تـەواوبوونی سـووتەمەنی کاردەکـەن، وەك لـە "گـەردوون ناسی"دا دەیخوێنن.. ئەم ئەستێرانە، بە چەشنێکی ڕوونـاك، ئامـاژە بۆ بەدیهێنەری خۆیان دەکەن.

بۆ نموونە: "خۆر" کە یەك ملیۆن جار لە زەوی خۆمان گەورەترە و یەك ملیۆن سالّیش لە زەوی کۆنترە، یەکێکە لەو گلۆپـە داگیرسـاوە هەمیشـەییيانەی میوانخانـەی خواوەنـدی میهرەبـان. جـا بـۆ ئـەوەی هەمیشـە دابگیرسـێت و گڕبگـرێ و سـووتەمەنی لێ نـەبڕێت، هـەموو ڕۆژێـك پێویسـتی بـە ئەنـدازەی دەریاکـانی زەوی سـووتەمەنی و، چیاکانی زەوی خـەلّووز و، چـەندین ئەوەنـدەی قـەبارەی زەویـش دار دەبێت، تاکو ئەو بەردەوامییەی بۆ برەخسێت..

کەچی ئەو توانسـتەی کـە "خـۆر" و هـەموو ئەسـتێرەکانی تـری هاوچەشنی خۆر دادەگیرسێنێت، بە بێ هیچ سـووتەمەنی و خـەلّووز و ڕۆنێك ئەم کارە دەکـات و نایـەلّێت بیشـکوژێتەوە و، بـە خێراییيـەکی یـەکجار گـەورەو بـێ لەیەکـدان لـە شـوێنی خۆیانـدا دەیانسـووڕێنێت. بێگومـان ئـەو توانسـتەی کـە ئـەم کـارە ڕایـی دەکـات، توانسـتێکی بێکۆتایی و دەستەلاّتێکی تا بلّێی گەورەی بێ سنوورە"[1].

---

١- دەقی کوردی ئەم نموونەیە و نموونەکەی پێشووتریش لە وەرگێڕانەکەی بەڕێز فاروق ڕەسوڵ یەحیاوە وەرگیراوە.

هێشتا من نموونەکەم تەواو نەکردبوو کە وتی:

ـ ئەم باسە زۆر قووڵە...

ـ شتێك گەردووونناسیم خوێندۆتەوە، هەر ئەوەندە خۆشە دەچیتە ناو ئەو جیهانە سەرنجڕاکێشەوە، ئیتر دەخنکێیت و هاتنە دەرەوە لێی مەحاڵە. وەکو ئەم نموونەیە دەریخست، هاوسەنگییەکی زۆر ورد لە گەردووندا هەیە، ئەم یاسایە چەندین لێکدانەوەی بۆ کراوە لە لایەن مرۆڤەکانەوە، سا ئیتر ئەم ڕێکوپێکییە چۆن و کێ بیپارێزێت. بەڵام دەمەوێت ئەوە بڵێم کە فەلەکناسی زۆری پێیە بۆ وتن بۆ ئەو کەسانەی لەدووی خوا دەگەڕێن.

بۆ ئەوەی باسەکە زیاتر دەوڵەمەند بکەم:

ـ کتێبێکی زانستیم لەسەر ئەم بابەتە خوێندبۆوە. ئەگەر مۆڵەتم بدەن حەزدەکەم ئەوەندەی کە لە خەیاڵمدا ماوەتەوە، بۆتانی باس بکەم.

سەرێکی ڕاوەشاند بە واتای "بفەرموو". منیش دەستم پێکرد:

– ئێزگەی ماونت پالومار لە ئەمریکا بۆ کاروباری گەردووونناسی، خاوەنی وردبینترین و بە هێزترین تەلەسکۆبە لە جیهاندا کە دەتوانێت هەشت سەد ملیۆن کاکێشان ببینێت. تەنانەت زانینی ژمارەی کاکێشانەکانی گەردوون کارێکی ئەستەمە، چونکە نازانین ئەو بەشەی ئێمە ئێستا دەتوانین بینین، چەندی هەموو گەردوون پێکدەهێنێت، لەوانەیە سەد ملیار کاکێشان، لەوانەشە زیاتر... زۆرێك لەم

کاکێشانانە سەد ملیار ئەستێرە لەخۆدەگرن و هەشیانە زیاتر، زۆربەی ئەم ئەستێرانەش هەزاران جار لەم خۆرەی خۆمان گەورەترن.

ئەم کۆمەڵەی خۆرەی کە ئێمەی تێداین تەنها یەکێکە لەو سەد ملیار کاکێشانەی تا ئێستا توانراوە بژمێردرێت. ئەستێرەکانی ناو کۆمەڵەی خۆریش بە سەد ملیار ئەستێرە مەزەندە دەکرێن. تیرەی کۆمەڵەی خۆر سەدهەزار ساڵی ڕووناکییە.(خێرایی ڕووناکی لە چرکەیەکدا سێ سەد هەزار کیلۆمەترە)، ئەگەر بمانەوێت لەمسەر بۆ ئەوسەری کۆمەڵەی خۆر بە موشەکێك، کە توانای بڕینی دەهەزار کیلۆمەتری هەبێت لە کاتژمێرێکدا، تەی بکەین ئەوا پازدە ملیار و هەشت سەد ساڵمان پێدەچێت. ئەگەر دوو کاکێشان بە هەمان ئاراستە بجووڵێنەوەو خێرایی ئەوەی دواوەیان لەوەی پێشەوەیان زیاتربێت، ئەوکاتە بە خۆیان و ملیۆنەها ئەستێرەوە بەیەکدا دەدەن. هەروەك چۆن هەموو ئەستێرەیەك خاوەنی چەند سووڕانەوەیەکی تایبەت بە خۆیەتی، کاکێشانەکانیش بە دەوری تەوەرەکانیاندا دەسووڕێنەوە. تێپەڕبوونی کاکێشانێك بەناو یەکێکی تردا ملیارەها ساڵی دەوێت، لە کاتێکدا تیرەی هەریەکەیان پتر لە سەد هەزار ساڵی ڕووناکییە، ئەمەش لە حاڵەتێکدا کە ئەستەمە ئەستێرەکانیان بەریەك نەکەون و هاوسەنگییان تێکنەچێت. ئایا دەبێت کێ ئەم سیستەمە ناوازەیەی، بەم ئەندازە وردو سەرنەکەر و، بەم ڕێسا دەراسا و سەرسووڕهێنەرانە، خستبێتەگەڕ؟

ڕێکەوت؟ سروشت؟ هۆکارەکان؟ یان خوایەکی شکۆمەند؟

دیسان سەرێکم هەڵبڕی و تەماشایەکی ئەو پیاوەم کرد کە بە ئەندێشە و مەراقێکی زۆرەوە گوێی بۆ گرتبووم، بێدەنگ بوو و بیری دەکردەوە. بەردەوام بووم:

ـ دەبینین کە یاسایەك لە گۆڕێدایە. هەموو بوونەوەرانیش بەڕێزەوە گوێڕایەڵی ئەم یاسایانەن. ئایا کێیە ئەم یاسایانەی داناوەو وا لە هەموو بوون دەکات ملکەچی بێت؟

ئەگەر نەیدەینە پاڵ خوایەکی یەکتا، ئەوا دەبێت یەکێك لەمانەی خوارەوە قبووڵ بکەین:

یەکەم: ئەگەر بڵێین گەردوون لەخۆیەوە دروست بووە، ئەو کاتە دەبێت هەموو گەردیلەیەك دارای زانستێکی فراوان و چاوێکی وابێت کە هەموو گەردوون ببینێت و ژیری یەکی وای هەبێت کە بەپێی هەموو گەردوون کاروبارەکانی ڕێکبخات، چونکە ئەوەی دەیبینین کارێکی یەکجار دانسقە و ناوازەیە، ئەگەر ئەم زانستە نەدرێتە پاڵ تەنها ئەندازیارێك، دەبێت باوەڕ بە بوونی ئەم زانستە گشتگیرە، نەك تەنها لە گەردوون و ئەستێرەکانی ناویدا، بەڵکو لە یەك بە یەکی گەردیلەکانیدا بکەین.

دووەم: ئەگەر بڵێین گەردیلەکانی گەردوون لە خۆیانەوە هاتوونەتە بوون و خاوەنی ئەو ژیری و زانستەشن کە باسمان کرد، ئەوا دەبێت دان بە ڕێکەوتنێکی بێ هەڵە لەنێوانیانداو

هاوئاهەنگییەکی وادا بنێین کە ملیارەها ساڵە بۆ چرکەیەکیش چیە، تێکیان نەداوە.

سێیەم: گەردیلەکانی گەردوون لە ڕێگەی دانانی ئەم یاسایانەوە هەم دەبنە یاسادانەر بە سەر ئەوانی ترەوەو هەم خۆیان مەحکوومی گوێڕایەڵی ئەم ڕێسایانە دەکەن، واتە هەم دەبنە یاسادانەرو هەم دەبنە یاساپارێزەر، لەکاتێکدا نەماندیوە هەردوو سیفەتی باڵادەستی و ژێردەستەیی لە خودێکدا کۆببێتەوە، چۆن دەتوانین بڕیاری ئەم حاڵەتە بەسەر گشت گەردیلە لەژمارەبەدەرەکانی گەردووندا بدەین؟

چوارەم: لە ئەگەرێکی لەم جۆرەدا دەبێت یەك بەیەکی گەردیلەکان فیداکارییەکی زۆر بێوێنەیان تێدابێت. ئەم هاوسەنگی و یاسا وردو ناوازەیەی لە هەموو کونجێکی ئەم گەردوونەدا خۆی دەنوێنێت و هەر لە ئەتۆمەکان و خانەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان پەیڕەوی لێدەکەن، ئایا دەنگونجێت ئەنجامی ڕێکەوت و هۆکارەکان بێت؟ لەپشت ئەم کارە ڕێکوپێکانەوە دەستێکی قودرەت دەردەکەوێت.

لێم پرسی: ئێوە دەڵێن چی مامۆستا؟

بێدەنگ و داڵغەی ڕۆیشتبوو:

ـ هەر دەبێت شتێکی تێدابێت...

زنجیرە شاخەکانی تۆڕۆس باوەشی بۆ گفتوگۆکەمان کردبۆوەو، دەتوت بەو جوانییە چاو ئەبڵەقکەرەی هەموو گەردیلەیەکی گەواهی

لەسەر بوونی خودا دەدەن و، بە زمانی حاڵ پێمان دەڵێن: "ئێوە سەیری ئێمە بکەن بەسە، ئێمە هەزارەها بەڵکو ملیۆنەها نموونەتان بۆ دەهێنینەوە". لە باوەشی سەوزایی و ئاوی سازگاری سروشتدا، گفتوگۆکەمان درێژەی دەکێشا.

## مەبەستی ئەم کتێبە !

کەسێکی زۆر زیرەك بوو. توانایەکی بێوێنەی هەبوو لە تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی شتاندا، بەجۆرێك هەستم دەکرد زۆرێك لەو باسانەی کە ساڵانێك بوو پێیان ئاشنابووم بەقەدەر ئەو لێیان تێنەگەیشتووم. دەستەواژە عوسمانییەکانی بە باشی دەزانی، شتێکی تریشی کە بووبووە جێی تێڕامان و سەرنجی من، ڕاستپەرستییەکەی بوو. ئەو دەمارگیرییە کوێرانە و کەللەڕەقییەی نەبوو کە لە زۆربەی هەوادارانی مارکسیزمدا دەبینرێت. ئەگەر شتێك لەگەڵ ژیریدا یەك بهاتایەتەوە و تەبا بووایە لەتەك پێوەرە عەقڵانییەکاندا، مەردانە سەری بۆ نەوی دەکرد.

نزیکەی کاتژمێرێك تێپەڕیبوو بەسەر گفتوگۆکەماندا، کە داوای کتێبەکەی کرد، ناوی نووسەرەکەی خوێندەوە وتی:

– ئێمە چەند هەڵە لەم نووسەرەو نووسینەکانی تێگەیشتبووین.

دۆستایەتییەکی گەرم لەنێوانماندا دروست بووبوو بەو ماوە کەمە، هەردووکمان باوەڕمان وابوو بە ئاسانی دەتوانین کار لەسەر خاڵە هاوبەشەکان بکەین و بگەینە ئەنجام.

"ئەو پیاوە" چەند جارێك ویستی باسەکە بگۆڕێت بۆ فەلسەفەو ئـابووری، منـیش هەمیشـە ڕامدەکێشـایەوە بـۆ نـاو بازنـەی یەکتاپەرسـتی، چـونکە دەمزانـی موناقەشـەکردن لەگـەڵ کەسـێکی زیرەکـی وەك ئـەودا لـە بوارەکـەی خۆیـدا (کـە فەلسـەفە و ئـابووری مارکسـیزمە)، سـەرەتا پێویسـتی بـە یـەکلایی کردنـەوەی مەسـەلە ئیمانییەکانە.

تایەکان چاکرانەوەو ئێمەش قۆڵ لە قۆڵی یەکدا گەڕاینەوە بۆ لای پاسـەکە، سەرنشـینەکانی تـر سـەیریان لـەم هاوڕێیەتیـە دەهـات و چـاویان لـێ نەدەتروکانـدین. داوام لـەو گەنجـە کـرد کـە لـەلای ئـەو پیـاوەوە دانیشـتبوو کـە دەکرێـت شـوێنەکانمان بگۆڕینـەوە؟ زۆر بەڕێزەوە داواکەمی پەسەند کرد، بەم جۆرە گفتوگۆی نـاو پاسـیش دەستی پێکرد.

ئـەم گفتوگۆیـەمان بـە درێـژایی ڕێگـا سـەرنجی سەرنشـینەکانی تریشـی ڕاکێشـابوو، کـە نـۆرەی قسـەکردنم دەهـات دەنگـم بـەرزدەکردەوەو حەزمـدەکرد سـوودێك بگەیـەنم بـەو کەسـانەی کـە کەوتبوونە ژێر کاریگەری وتارەکـەی ئـەو پیـاوەوە، بـۆ سـاتێك گـوێم هەڵخست، لە دەنگی پاسـەکە زیـاتر ورتـە نـەدەهات، هـەموو نقـەیان لەخۆیان بڕیبوو و گوێیان لە ئێمە گرتبوو.

"ئەو پیاوە" لەناوەڕاستی قسەکانمدا پێی بڕیم و وتی:

- مامۆستا پرسیارێکت لێدەکەم، بەڵام پەیمانم بدەرێ بەڕاستی وەڵامم بدەیتەوە.

زۆر سەرم لەم پرسیارە ناوەختەی سووڕما، دیسانیش بە هێمنی وەڵامم دایەوە:

- فەرموون بەڕێزم، دڵنیابە کە ڕاستیت پێدەڵێم.

برۆکانی وەك کەوان هاتنەوە یەك و بە دەنگێکی گڕ وتی:

- لەیەکەم گفتوگۆماندا کە کتێبەکەت بۆ دەخوێندمەوە وا خۆت دەردەخست کە هیچ نازانیت، هەر بەڕاستی لێی تێنەدەگەیشتیت؟ یان ئەوە ڕێگایەك بوو بۆ گەیاندنی بۆچوونەکەت بە من؟

هاوڕێ زیرەکەکەم درەنگ نەکەوت لە شیکارکردنی مەتەڵەکە.

بەهێواشی و لەژێر لێوەوە وەڵامم دایەوە:

- تێیدەگەیشتم گەورەم، بەڵام بێگومان وەکو جەنابتان نا...

- کەواتە بۆ ئەوەی شتێکم پێبگەیەنیت خۆت خستە قاڵبی نەزانەوە، وایە؟ ناچاربووم دانی پێدا بنێم:

- ڕاستە ئەو ڕێگەیەم بەکارهێنا بۆ گەیاندنی چەند ڕاستییەك بە ئێوە، بەڵام هەرگیز ناتوانین ناوی بنێین فێڵ، ناچاربووم بەوە لێتان نزیك ببمەوە. ئەم قسانە زۆر بەناڕەحەتی توانیم بیانکەم، کەچی ئەو وتی:

- نەخێر، نەخێر! من بۆ ئەوە نەمپرسی کە توورەبووم یان بمەوێت سووکایەتیتان پێبکەم، بەپێچەوانەوە دەمەوێت بەگەرمی

سوپاستان بکەم، بەڕاستی باشترین ڕێگات هەڵبژاردووە بۆ تاوتوێکردنی ئەم باسانە لەگەڵمدا. ئەمانە باس گەلێکن کە دەمێک ساڵە مێشکمیان قاڵ کردووەو بێزاریان کردبووم، چاکتان کرد ئەم مەسەلەیەتان هێنایە ئاراوە، هێشتا لە سەرەتای ڕێگەکەداین و گومانم نییە لەوەی دەتوانم لەگەڵ هاوڕێیەکی باشی وەك تۆدا بگەین بە شتێك.

ئینجا خۆی پرسیاری دەکرد، سەرەتا پرسیاری لەو مەسەلانەی ئیسلام کرد کە داخراو دیارن و پێویستیان بەڕوونکردنەوە هەیەو، هەر لەبەر ئەمەش دووچاری هێرشی ماتریالیست (ماددەگەرا)ەکان بوونەتەوە. بەتایبەتی گرنگی بەو بابەتانە دەدا کە پێویستیان بەبەڵگە و ڕاڤە هەیە. یەکەم پرسیار وتی:

- زۆرێك لە زانایان ماددە بە ئەزەلی لەقەڵەم دەدەن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەبەدیی‌و هەمیشەییشە، واتە ماددە بنەمای گەردوونە، ماددەش کە ئەزەلی و ئەبەدی بێت پێویستی بە خوایەك نیە بەدیبهێنێت.

دەمزانی ڕووبەڕووی چەندەها پرسیاری هەستیار دەبمەوە سەبارەت بە ئیسلام و قورئان بۆیە بەدرێژایی گەشتەکەم هەژاری و کوڵەواریم کردبووە تکاکاری خۆم لەبەردەم دەرگانەی خوای میهرەبان و، پڕبەدڵ لێی دەپاڕامەوە سەرکەوتووم بکات لە گەیاندنی

ئەم پەیامە پیرۆزە، چ بە پیاوەکەی بەرامبەرم و چ بە سەرنشینەکانی تر. بە یارمەتی خوا کەوتمە قسە:

- بە ڕای من پێش ئەوەی لەوە بکۆڵینەوە کە ئایا ماددە ئەزەلی "بێ سەرەتا" و ئەبەدی "بێ کۆتا" یە یان نا، دەبێت سەرەتا خودی ماددە بناسین، ئایا ماددە چیە؟ چییەتی و تایبەتمەندێتی و ئەو یاسایانە چین کە ملکەچیانە؟ دواتر دەتوانین پێناسەیەکی ماددە بکەین، بۆ ئەوەی لە ماددە تێبگەین، دەبێت لە بچووکترین پارچەیەوە دەست پێبکەین کە گەردیلەیە. گەردیلەکان بە بەردی بناغەی بینای گەردوون دادەنرێن. گەردیلەکان بەڕێژەی جیاواز یەکتردەگرن و گەردەکان پێکدەهێنن. دەورووبەرمان بە گیاندار و بێگیانەوە لەم گەردانە دروستبوون.

چوار یاسا پێکهاتەو جوولەی ناوەوەو جوولەی دەرەوەو پەیوەندی نێوان گەردیلەکان ڕێکدەخات، بەهۆی ئەم یاسا وردو هاوسەنگانەوە گەردوون و ئێمە هەین. یەکەمیان هێزی ناوکییە کە ناوکی گەردیلە پێکدەهێنێت. دووهەمیان هێزی ئەلکترۆنییە کە بەرپرسە لە بوون و سووڕانەوەی گەردیلەکان لەسەر ڕەوگەی خۆیان بەدەوری ناوکدا، ئەگەر هێزی سێهەم کە هێزی کارۆموگناتیسییە نەبێت گەردیلەش پێکنایەت، ئەگەر هێزی چوارەمیش کە هێزی ڕاکێشان و پاڵپێوەنانە نەبێت گەردوون نەدەبوو، دنیا و ئێمەش نەدەبووین.

بەكورتی نەبوونی یەكێك لەم چوار هێزانە، دەبێتە هۆی كۆتایی هێنان بە بوون. تەنانەت كورتهێنان و هەڵەیەكی بچووك لە یەكێكیاندا هەمان ئەنجام بەرهەم دەهێنێت. دەبێت لێرەدا بچووكی گەردیلەكانیش لەیاد نەكەین، لەهەر سانتیمەتر سێجایەكی هەوادا پێنج ملیۆن كەرەت پێنج ملیۆن گەردیلە هەیە.

لەژێر ڕۆشنایی زانستی سەردەمداو لە چوارچێوەی پیشەكەی خۆمدا نموونەیەكم هێنایەوە لەسەر چۆنێتی كاركردنی گەردیلەكان:

- گریمان لە پۆلێكدا مامۆستاین، پانزە بۆ بیست قوتابیش لەناو خۆیاندا قسەبكەن، دەنگی هەموویان بێ ئەوەی تێكەڵاوی یەكتربن و بەهەمان خێرایی لەڕێگەی گەردیلەكانەوە بە ئێمە دەگەن. هەر هەمان گەردیلە ڕووناكی و گەرمی و حەوت ڕەنگەكەی تیشكی خۆر دەگوازنەوە ناو پۆلەكەمان، گەرمی سۆباكەشمان گەردیلەكان هەڵیدەگرن و بڵاویدەكەنەوە بە ژوورەكەدا. هەر لە هەمان كاتیشدا دەنگی دووری ڕادیۆیەك، چەخماخەیەك، زەنگێكمان پێدەگەیەنن. هەموو ئەمانە كاری هەمان گەردیلەن. ئەگەر سەد هەزار كەس لەدەوری پۆلەكەمان كۆببنەوەو هەموویان بە دەربڕین و زمان و لەهجەی جیاواز بانگمان لێبكەن، گەردیلەكان بێ تێكەڵاوكردن و بەهەمان خێرایی پێمان دەگەیەنن. گەر ببیستین كەسێك هەیە لەیەك كاتدا پێنج شەش ئیش بەیەكەوە دەكات، بۆ نموونە: لەگەڵ یەكێكدا قسەبكات و گوێی لەیەكێكی دی گرتبێت و، كتێبێك بنووسێتەوەو،

مێشکیشی خەریکی شیکارکردنی پرسیاری بیرکاری بێت، دەیکەینە مانشێتی ڕۆژنامەکان و ڕیکۆردی جیهانی دەشکێنێت. ئایا شتێکی بچووکی بێ گیانی بێ هەستی بێ چاوی بێ ژیریی وەك گەردیلە، چۆن دەتوانێت لەیەك کاتدا هەزارەها کار بۆکەموکورتی و لێتێکچوون بە هەمان ڕێکوپێکی، رابپەڕێنێت؟

ئایا کێ ئەم هێزە بێ وێنەو ناوازانەی داناوەو هەر لە گەردیلەیەکەوە تا کاکێشانەکانی ملکەچی فەرمانەکانی کردووە و هاوسەنگیی گەردوون بە زانست و توانستێکی ڕەها بەڕێوە دەبات؟ کێ خاوەنی ئەم هێزانەیە؟ چ ڕێکەوتێك یان چ سروشتێك دەتوانێت کارێکی وا دەرئاسا بێنێتە گۆڕێ؟

لێرەدا هاوڕێکەم بە پرسیارێك پێی بڕیم:

- ئایا ناکرێت لە سەرەتادا کۆمەڵێك یاسای سەرەتایی هەبووبن و پاشان ئەم یاسایانە خۆیان بگونجێنن و خۆیان تازە بکەنەوەو لە شێوەی ڕێسای باشتر و ئاڵۆزتردا خۆیان دەربخەن؟

پرسیارەکە بۆ ئەو مایەی تێڕامان و بۆ من جێی پێکەنین بوو، بە زەردەخەنەیەکەوە وتم :

- ببوورن بەڕێزم، بەڵام من ئێستا دەمەوێت هەمان پرسیار هەڵگێڕمەوەو لە خۆتانی بکەم. با بڵێین یاسایەکی سادە لە مەیداندایە، ئایا دەگونجێت ئەم یاسایە بێ یاسادانەرێك خوڵقابێت؟ یان ئایا دەتوانین بیر لە یاساکانی حامورابی بکەینەوە بێ حامورابی

خۆی؟ مەبەستم ئەوەیە کە گریمان لێرەدا لم و چیمەنتۆ و ئاسن و بەرد هەبێت. ئایا ڕێی تێدەچێت ئەمانە بێ وەستا و بێ پرۆژە و پلانێك بێنە تەنیشت یەك و کۆشکێك بینا بکەن؟ ئایا دەگونجێت ئەم کاروانسەرا جوان و کاملەی گەردوون بەمجۆرە هاتبێتە بوون؟ ئێمە وادەزانین بە چەند یاسایەکی سادە ئیتر هەموو نهێنییەکانی سیستەم و ڕێسا سەرسامکەرەکەی گەردوونمان ڕاڤە کردووەو بەمجۆرە خۆمان لە مەسەلەکە دەرباز دەکەین. تەنها بە دۆزینەوەی یاساکان کارەکە تەواو نابێت، بەڵکو کارە سەرەکییەکە لە دوای دۆزینەوەی دانەری ئەم یاسایانەوە دەست پێدەکات. مرۆڤ دارای تاسەمەندی و مەراقێکە لەسروشتیدا، دەبێت لەڕێی ئەم مەراقەوە بەدوای بەدیهێنەری ڕاستەقینەی شتاندا بگەڕێت سەرسامی بەرامبەر کارەکانی دەرببڕێت و سوپاسی بکات بۆ بەخششە لەژمارە نەهاتووەکانی.

چۆن مرۆڤ دەتوانێت سەرسامی دەرنەبڕێت و بێئاگابێت لەو زاتەی کە لە تۆوێکی بچووکی وەك هەنجیر هەزارەها میوەی بەتام و بەلەزەت و، لە گەردیلەیەکی گچکەی بێ گیان هەموو بوونەوەرە زیندوو و نازیندووەکان دروست دەکات؟ یان چۆن دەتوانێت خۆی لەو زاتە بدزێتەوە کە بە چوار هێز گشت کاروبارەکانی گەردوونی ڕاگیرکردووە؟ چۆن دەتوانێت جارێکی تر چاوەکانی بقوچێنێت لە ئاست خاوەنی ئەم گەردوونەدا دوای ئەوەی ئەم نهێنییانەی بۆ دەرکەوت؟

- کەواتە ماددە ئەزەلی نییە، وایە؟

ـ هێزێك هەیە کە ماددە بەڕێوە دەبات، هێزێك کە شکڵ و شێوەی پێدەدات و ملکەچی چەند یاسایەکی دەکات و لە خزمەتی مرۆڤدا دەیخاتەگەڕ...

ـــ بەڵام دەوترێت کە هێشتا ئەزەلی نەبوونی ماددە نەسەلمێنراوە؟

ـ پێچەوانەکەشی هەر نەسەلمێنراوە، لەم ساڵانەی دوایی دا زانایان بەپێی تیۆری تەقینەوە مەزنەکە (big bang) گەیشتنە ئەنجامی ئەوەی کە گەردوون سەرەتایەکی هەیەو ئەمەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ گوفتاری پیرۆزی قورئاندا، ئەم تیۆریە تا ئێستا باشترین بۆچوونی داوە بەدەستەوە سەبارەت بە دروستبوونی گەردوون و متمانەیەکی زۆری پێدەکرێت لە ناوەندە زانستییەکاندا.

لەسەرخۆ وتی:

- بەڵێ، منیش ئەوەم بیستبوو، بەڵام زانیارییەکی تەواوم نیە لەسەری، ئەگەر داوایەکی بەزەحمەت نیە، حەزمدەکرد گوێم لێی بووایە.

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو پاڵی دایەوەو چاوی بڕییە ئاسۆیەکی نەبینراو.

## تەقینەوە گەورەکە

هەوڵمدا تا دەتوانم تیۆریەکە کورت بکەمەوە:

ـ تەقینـەوە مەزنەکـە نـاوی ئـەو تیۆریەیـە کـە تایبەتـە بـە سـەرهەڵدانی ئـەم گەردوونـەی ئێسـتا دەیبیـنین و تـا ئێسـتاش لـە ناوەندە ئەکادیمی و زانستییەکاندا بڕواپێکراوەو نرخی تایبەتی خـۆی هەیە. ئەم بیردۆزە سەرەتایەك بۆ گەردوون پشتڕاست دەکاتەوە.

بە گوێرەی ئەم تیۆریە لەسەرەتادا هەموو گـەردوون ماددەیـەکی گەرم و چڕ بووە، ئەم بارستەیە بـەهۆی تەقینەوەیەکـەوە بڵاوبۆتـەوە بەناو بۆشاییدا، هـەر ئـەم پارچـانە دواتـر مـاددەو وزەی گـەردوونیان پێکهێناوە. پاشـان مـاددەو تیشـکدانەوە بەڕێـژەی گونجـاو و جیـاواز بەسەر گەردووندا دابەش کراوە، کە زەمینەی لـەباریش هاتۆتـە پـێش گەردیلەکانیش بەپێی ئەو مۆدێلەی بۆیان دانـراوە، دروسـتبوون. ئـەو یاسـایانەی کـە ئێمـە پێیـان دەڵـێین ڕێسـا فیزیـایی و کیمیاییـەکان، پەیوەندی نێوان گەردیلەکانیان دیاری کرد. پرۆتـۆن و نیـوترۆن -کـە پێکهاتەی گەردیلەن- و توخمە قورسەکان هاتنە بوون، ئەسـتێرەکان هەڵهاتن و خۆر هێنرایە مەیدان. لێکۆڵینەوە نوێیەکانی ئەم دواییانـە لەم بوارەدا جەخت لەوە دەکەنەوە کە تـا دێـت کاکێشـانەکان لەیـەك دوور دەکەونەوەو گەردوون فـراوانتر دەبێـت. ئەگـەر ئـەم فراوانبوونـە پێچـەوانە ببێتـەوە، گـەردوون دەبێتـەوە بـەو مـاددە بچـووکەی

یەکەمجار، ئەم لێکۆڵینەوانە دەری دەخەن کە گەردوون لە خاڵی سفرەوە دەستی پێکردووە.

قورئانی پیرۆز ئاماژە بەوە دەکات کە ئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش ڕۆژدا و زەوی خۆشمان بە دوو ڕۆژ دروستکراوە. لێرەدا مەبەست لە "ڕۆژ" ئەو گۆڕانە کاتییە گەورانەیە کە گەردوون پیایاندا تێپەڕبووە، قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەم ڕۆژانە دەکات و بە هەزار ساڵ بەڵکو بە پەنجا هەزار ساڵی گۆی زەوی بەراوردی دەکات. خوای مەزن لەسەرەتادا گشت گەردوونی دەورەداوە بە ماددەیەکی شلی وەك ئاو کە پێی دەوترێت "ئەسیر"، پاشان ئاسمانەکان و زەوی لەم ماددەیە پێك هێناوە.

مامۆستا سەعیدی نوورسیش کە یەکێکە لە کەڵە زانایانی ئەم سەدەیەمان سەبارەت بەو ماددەیەی کە گەردوونی لێ دروستبووە، ئاماژە بە حەوتەم ئایەتی پیرۆزی سوورەتی هود دەکات و دەفەرموێت: "عەرشی خوای مەزن لەسەر ماددەیەکی شلی ئاوئاسا بووە. پاش بەدیهێنانی "ئەسیر" ئەم ماددەیە گۆڕدراوە بۆ گەردیلەکان، واتە بووەتە ماددەی خاوی گەردوون".

خوای گەورە ئەم ماددەیەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و کردوویەتی بە بناغەیەك بۆ دروستکراوانی تر و لێیەوە گەردیلەکانی بەدیهێناوە، گەردیلەکانیش لە زەمینەیەکی گونجاودا بەڕێژەی جیاواز یەك دەگرن و ماددە ڕەق و شل و گازییەکان دروست دەکەن، یەکەم

بارستاییش که ساردبووبێتەوە و ڕەق بووبێت پاش تەقینەوەکە ئەم زەوییەی خۆمانە. لەکاتێکدا ئەستێرە و هەسارەکانی تر بۆ ماوەیەکی زۆر بە شێوەی گازی و پاشان بارستەیەك ئاگری شل بوون، کەچی زەوی لە پێش هەموویانەوە ساردبۆتەوەو توێکڵی تایبەت بەخۆیی بەبەردا کراوەو مەرجەکانی ئەم ژیانەی ئێستامانی بۆ دابین کراوە. قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: "ئاسمانەکان و زەوی لکابوون بەیەکەوە، دواتر ئێمە لەیەکمان جوێ کردنەوە". ئەمەش حەقیقەتێکە کە لەگەڵ زانستی مۆدێرندا یەکدەگرێتەوە.

هاوڕێ گوێگرەکەم دیسان پێی بڕیم:

- زۆر سەیرە مامۆستا، ئەوەی ئێوە وتتان دەربارەی ماددەی ئەسیر، من هیچ نەمبیستبوون، جوانترین لێکدانەوەیە تا ئێستا بیستبێتم لەسەر دروستبوونی گەردوون.

بەردەوام بووم:

- زۆرێك لە زانایان دەفەرموون ئایەتی پیرۆزی :"هەموو شتێکمان لە ئاو دروست کردووە." ئاماژەیە بۆ ئەسیر، چونکە ئەم ماددەیە وەکو ئاو شل و ناسك و تەنك و بزۆکە.

"ئەو پیاوە" تا دەهات ملەجیڕێی دەکرد، وتی:

- مامۆستا من ئەم "لەنەبوونەوە دروستکردن"ەم پێ قبووڵ ناکرێت، شتێك چۆن لە "هیچ"ەوە دروست دەبێت؟ شتی نەبوو واتە

ماددەی نییە، شتێکیش ماددەی نەبێت چۆن دەتوانرێت بەدیبهێنرێت؟

- خوای گەورە دوو جۆر کاری هەیە، یەکەمیان بەدیهێنانە کە لە هیچەوە دروستی دەکات، دووەمیان بریتییە لە پێکهێنان کە بوونەوەرێك لە چەند ڕەگەز و پێکهاتەیەکی تر بینا دەکات.

ماددەی ئەسیر کە بە پوختەی بوونەوەران دادەنرێت و هەموو گەردوون لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، لە هیچەوە بەدیهێنراوە. ئەم ماددەیە دانستی خوایی دەیتەقێنێتەوەو لەمەوە ئەتۆم و وزەو ڕەگەزە سەرەکییەکانی تر دروست دەبن، ئیتر ئەم هەموو ئاڵوگۆڕانەی تر کە بەسەر بووندا هاتوون خۆیان لە "پێکهێنان"دا دەبیننەوە. ئێستا شتێك نیە بەناوی "لە نەبووەوە دروستبوونی گەردیلەکان"، تەنها لە سەرەتادا ماددە پێویست بووەو بەدیهێنراوە. هەموو بەهارێك ملیۆنەها ڕووەك و زیندەوەر زیندوو دەکرێنەوە، ئەمانە لە شێوەو ڕەنگ و بۆنیاندا جیاوازن لەوەی بەهاری پێشوو و لە "نەبوو"ەوە بەدیهێنراون. بەڵام پێویستە تایبەتمەندییەکانی ئەم دروستبوونە بە فەرمانی "ببە" بزانین. شتێك ئەگەر بوونی دەرەکی (ماددی) نەبێت، لای ئێمە بە نەبوو دادەنرێت، لەکاتێکدا سەبارەت بە خوای گەورە شتێکی زانراوە، چونکە زانستی خوا گشتگیرەو هەموو شتێك لەخۆدەگرێت، هیچ شتێکیش ناکەوێتە دەرەوەی بازنەی زانستی خواییەوە. کاتێك شتێك لە جیهانی "زانست"ەوە دێتە

جیهانی "توانست" و بەرگی ماددە دەپۆشێت، لای ئێمە لە نەبوونەوە دروست کراوە، بۆیە ناتوانین بڕیاری نەبوونی ڕەها بەسەر هیچ شتێکدا بدەین. با بڵێین شتێك دروست دەکرێت و لەوەوپێش هیچ نموونەو مۆدێلێکی نیە. بەڵام ئەو شتەی کە تازەیە بە ئێمە و پێشتر نموونەیمان نەدیوە، لە بازنەی زانستی خوادا بوونی تایبەتی خۆیی هەبووە. ئەگەر ئەم شتە بوونی ماددی وەرنەگرێت، ئێمە ناتوانین پەیی پێبەین. کە دێتە جیهانی ماددەشەوە دەڵێین لە نەبوونەوە دروست کراوە، چونکە توانای ئاوەزی مرۆڤ هەر ئەوەندە هەڵدەگرێت، لە حاڵێکدا ئەو شتە لە بازنەی زانستی خوایی دایەو هێشتا بوونی ماددی وەرنەگرتووە.

- ئەی لەناوبردن؟ شتێك کە دارای ماددە بێت چۆن لەناودەچێت؟

لەڕاستیدا گوێگرەکەم دەیویست لەمەوە بگات بە: "خوا چۆن دەتوانێت ماددە لەناوبەرێت؟ ئەگەر وایە کامەیە نموونەکەی؟ ئەگەر یەکێك نەتوانێت شتێك لەناوبەرێت، چۆن دەتوانێت بیبێتە بەدیهێنەر؟ لە تۆنی دەنگیەوە هەستم بەمەکرد.

- هەموو زستانێك ملیۆنەها ڕووەك و درەخت بەلق و پۆو گوڵ و گەڵاکانیانەوە لەناودەبرێن و بەرەو جیهانێکی تر بەڕێ دەخرێن.

گریمان دارمان کردە سۆبایەکەوە، دەبینین دارەکە دەبێتە خۆڵەمێش و کێش و بۆن و ڕەنگەکەی و ڕەهەندی پانی و درێژییەکەی لەناودەچێت. لەوانەیە بە کۆکردنەوەی خۆڵەمێش و وزە و

دووکەڵەکەی، دووبارە بتوانین کێشی دارەکە بەدەست بهێنینەوە، بەڵام ناتوانین شێوەو ڕەنگ و بۆنەکەی بگێڕینەوە، چونکە ئەمانە لەناوچوون. لێکۆڵینەوە نوێیەکانی بواری فەلەکناسی ئاماژە بە "کونە ڕەشەکان" دەکات کە هێشتا بەتەواوەتی لە سروشتی چییەتیان نەگەیشتووین. ئەم توێژینەوانە دەریدەخەن هەندێك لەو ئەستێرانەی کە بە هەزاران جار لە زەوی گەورەترن، ئەم کونە ڕەشانە هەڵیاندەلووشێت و ون دەبن و لە جیهانی مادده دەچنە دەرەوە، هێزی کێشکردنی ئەم کونە ڕەشانە بە ناکۆتا مەزەندە دەکرێن، ئەم کونانە لە بیرێکی بێ بن دەچن کە گەرمی و ڕووناکی و دەنگ و هەموو جۆرە تیشکدانەوەیەك قووت دەدات و ئەستێرە زەبەلاحەکان هەڵدەلووشێت. لەم سۆنگەیەوە کونە ڕەشەکان بە دەلاقەیەك دادەنرێن کە ئەوسەری بە جیهانی بێ کۆتا دەگات.

پەنجەکانی ئالاندە یەك و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا:

- دەزانی مامۆستا، هەرچەندە ئەمانەی وتت بە تەواوی دڵیان تێر نەکردووم، بەڵام ماقووڵترین لێکدانەوەیە تا ئەمڕۆ بیستبێتم، دەبێت بە سنگێکی فراوانەوە ئەمە قبووڵ بکەم. هێشتا ڕێگەیەکی درێژمان لەبەردەمایە...

گەنجێك لە دواوە بەدەنگێکی بەرز و زبر هەڵیدایە:

ـــ ئێمە خوا نابینین مامۆستا، بەڵام مادده دەبینین و بەرجەستەیەو هەستی پێدەکەین. خوایەکی نەبینراو چۆن دەتوانێت

کاریگەریی لەسەر مادده هەبێت و ئاڕاستەی بکات و ڕێکی بخات، ئەمە ڕێی تێدەچێت؟

وامدەزانی هاوڕێکەی تەنیشتم بەم لایەنگرەی کە بۆی پەیدابوو دڵخۆش دەبێت، کەچی لەپڕ دەموچاوی تێکچوو و ئاوڕی بۆ گەنجەکە دایەوەو مۆڕەیەکی لێکرد. سەرم سووڕما. دواتر بۆم دەرکەوت حەزی بە شێوازی ڕەق و ناشرینی گەنجەکەی نەکردووە و بە ڕای ئەو دژی یاساکانی موناقەشەو گفتوگۆ بووە.

من لەسەر هێمنی و لەسەرخۆیی خۆم بەردەوام بووم و هەوڵم دا وەڵامی گەنجەکە بدەمەوە:

ـ پادشا بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتەکەی یاساگەلێك دادەنێت و کۆمەڵێك بەرپرسیش دیاری دەکات بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایانە، پاش ئەوەی یاساکان دانران و ئارامی و ئاسایش دابینکرا، ئیتر وڵات دەچێتە سەر ڕێڕەوی خۆی، ئیدی ئەگەر کەسێك سەرپێچی یاساکان بکات، پادشا نا، بەڵکو بەرپرسان دەیگرن و دادوەر سزای دەدات، هیچ پێویستی ناکات پادشا بۆ خۆی بچێت تاوانباران دەستبەسەر بکات و لە کووچە و کۆڵانەکاندا بسووڕێتەوە.

بەهەمان جۆر خوای باڵادەستیش کە خاوەنی بوونەوەرانە، بەو ڕێسا گشتگیر و قەشەنگانەی دایناون، کاروباری ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات. لە بچووکترین ئەتۆمەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان ملکەچی ئەم یاسایانەن. ماف و ئەرکی هەموو شتێك دیارە و ڕوونە. شتان

فەرمانبەرێکی گوێڕایەڵی ئەم ڕێسا بەڕێزانەن، ئەم یاسایانەی لە سەرەتای دروستبوونی بوونەوەرانەوە دانراون، ئێستاش بە هەمان ڕێکوپێکی دەڕۆن بەڕێوە. گەردیلەیەك لە ڕێڕەوی خۆی لابدات، هاوسەنگی تێکدەچێت و قیامەت ڕوودەدات. مرۆڤی ژیر بە تێفکرین لە بوونەوەران دەستی توانستی خواوەند لە هەموو شتێکدا دەبینێت. گەنجەکە یا دەیویست ڕەخنە لە وەڵامەکە بگرێت، یان خۆی ئامادە دەکرد بۆ پرسیارێکی تر، کە هاوڕێکەی تەنیشتم کەوتە خۆیی و وتی:

- با باسی ئەو نەبینینە بکەین، ئەگەر خوا هەیە بۆچی نابینرێت؟ یان خوا چۆن چۆنییە؟ لەچی دەچێت؟

گفتوگۆکە تا دەهات کەشێکی زانستی وەردەگرت، هەنووکە هاوگەشتەکەم جددی و وردتر گوێی بۆ گرتبووم و هەوڵیدەدا خۆی بەدووربگرێت لە بڕیاری وشك و پێش وەخت. سەرەتا مەبەست لە پرسیارەکانی ئەوەبوو بێزار بکات و تەریقم بکاتەوە، بەڵام ئێستا بەڕاستی دەیویست وەڵامەکانیان بزانێت و لەگەڵ ژیریی خۆیدا بەراوردی بکات، شتێك لەگەڵ ژیری ئەودا یەکی نەگرتایەتەوەو یان لێی تێنەگەیشتایە، داوای لێدەکردم ڕوونکردنەوەی زیاتر بدەم. خەریك بوو وەڵامم دەدایەوە کە پاسەکەمان لەبەردەم چێشتخانەیەکی سەرڕێگادا وەستا بۆ پشوودان، پێکەوە دابەزین و چووینە کونجێکی چۆڵەوە.

## چۆن باوەڕ بەو شتانە بهێنین کە نایانبینین !!

هاوڕێکەم ئەو باوەڕ بەخۆبوون و دڵنیاییەی یەکەمجاری نەمابوو. هەستم دەکرد شڵەژاو و سەغڵەت و نائارامە.

زۆرم وت بەس ئەو سووربوو لەسەرئەوەی نانخواردنەکە عایدی خۆی بێت، لە کاتی چا خواردنەوەکەدا وتم:

- ئەگەر مۆڵەت بدەن دەمەوێت وەڵامی پرسیارەکەتان بدەمەوە، ئێرە هێمنترە.

دەمزانی کە دەتوانین لێرەدا درێژە بە باسەکە بدەین، بۆیە بە درێژایی نان خواردنەکە لە خەیاڵی پرسیارەکەدا بووم و وەڵامەکەیم لە "پەیامەکانی نوور"ەوە هەڵگۆستبوو:

- با لە بەشی دووەمی پرسیارەکەوە دەست پێبکەین، دیارە کە زانینی بوونی شتێك جیایەو زانینی چییەتی و ماهیەتی ئەو شتە جیایە. زۆر شت هەن لە دەوروبەرماندا کە بە ژیریمان پەی بە بوونیان دەبەین و کەچی لە ماهییەتیان ناگەین، وەك ئاوەز، ڕۆح، خەیاڵ، هێزی ڕاکێشانی زەوی، کارەبا، خۆشەویستیو چەندەهای تر. بەگوێرەی دەستووری: "بەدیهێنراو پەی بە بەدیهێنەری خۆی نابات"، ئێمەش ناتوانین لە چیەتی زاتی بەدیهێنەری خۆمان، کە خوای گەورەیە، بگەین، چونکە ژیری ئێمە دروستکراوی خوایە، ژیریش وەك هەر دروستکراوێکی تر سنوورێکی دیاریکراوی خۆیی هەیە، ئاوەزێکی سنووردراریش ناتوانێت پەی بە ماهیەتی پیرۆزی

خواوەند ببات. لەهەر پێشبینی و پێوانەیەکیدا هەڵە دەکات و ناگات بە ئەنجام.

خـوای مـەزن بـێ سـنوورەو ڕەهایـە و ئـەزەلی و ئەبەدییـە، لەبەرامبەردا ژیری مرۆڤیش سنوورداره و وابەستەی کات و شـوێنە و چوارچێوەیەکی داخراوی هەیە. هەر لەبەر ئەمەیە کە سنووردار بـێ سنوور و، فانی ناتوانێت باقی هەڵبسەنگێنێت و لـە نهێنـی ماهیـەتی "چییەتی" تێبگات. چونکە خوای گەورە نموونەو لێچوو و دژی نیـە، ئاوەز ناتوانێت پێی بگات و بیهێنێتە پێش چاو، چونکە زاتـی ئـەو لـە هیچ شتێکی ئەم گەردوونە ناچێت تا ئێمە هەستین بیپێوین پێی، بۆیە ماهیەتی ئەو لە هیچ یەکێك لەو ماهیەتانـە ناچێت کـە ئێمـە ئاشـناین پێیان. ئێمە پێشبینی و لێکدانەوەکانمان لەسـەر بنـەمای ئـەو شـتانە دەکەین کە بینیومانن و بیستوومانن یاخود دەتـوانین بیهێنینـە پـێش چـاوی خۆمـان و بـیری لێ بکەینـەوە، لەبـەر ئەمـە بـەم توانـا گچکەیەمانەوە هەموو چەشنە هەوڵێکمان لە هەمبەر ناسینی ماهیەتی بێ سنووری ئەودا کورت دەهێنێت. جیهانی بـوون تـەنها ئـەم جیهانـە بچووکە نیە کە ئێمە بە پێـنج هەسـتەکەمان هەسـتمان پێـی کـردووە. مرۆڤ بە چاوەکانی تەنها دەتوانێت ئـەو شـتانە ببینێـت کـە مـاددین و بەرجەستەن، زمانی تام دەکات و گوێشی دەنگەکان دەبیستێت. بێـت و یەکێك بڵێت من باوەڕ بە شتێك ناکـەم تـا بـە چـاوی خـۆم نـەیبینم، ئەوا ئەم کەسە ئـەرکی عـەقڵی سپاردووە بـە چـاو، چـونکە نـەبینران

بەڵگە نیە لەسەر نەبوون. ناتوانین ئینکاریی بوونی شتانێك بكەین لەم جیهانەدا كە دەكرێت بیانبینین، بەڵام ئێستا لەبەرچاوماندا نەبن، بۆیە پێویستە هەریەك لە پێنج هەستەكەمان لە بوارو شوێنی خۆیاندا بەكاربهێنین، وەكو چۆن ناتوانین زمانمان لە بیستندا و گوێچكەمان لە بینیندا بەكاربهێنین، بە هەمان جۆر ناتوانین ئەركی تێگەیشتن و لێكدانەوەو پەی بردن بدەین بە چاو. ئەمە كاری ژیرییە، بۆ نموونە باوەشكردنی دایكێك بەمنداڵەكەیدا دەبینین بەڵام ناتوانین سۆز و خۆشەویستییەكەشی ببینین، بەڵكو بە ژیریمان هەستی پێ دەكەین. دەتوانین بە چاو بینایەك ببینین، بەڵام تەنها بە ژیری دەرك بە هونەر و جوانییەكەی دەكەین. نەبینرانی خوا لەوەوەیە كە دژی نییە. بۆ ناسین و ئاشنابوون بە شتێك پێویستیمان بە دژەكەی هەیە تا لەم رێیەوە لێی تێبگەین، تەنانەت خۆر لەوپەڕی درەوشانەوەیدا ناتوانین تەماشای بكەین و ببینین. مامۆستا سەعیدی نوورسی وتەیەكی زۆر جوانی هەیە كە دەفەرموێت: "ئەوانەی لەناو ماددەدا بەدوای هەموو شتێكدا دەگەڕێن، عەقڵیان لە چاویاندایە، دیارە چاویش لەجیهانی مەعنەویات (مێتافیزیك)دا كوێرە".

هاوڕێكەم دوایین ڕستەی پێ دووبارە كردمەوەو ستایشی كرد. بە ڕوخساریدا بۆم دەركەوت سوودی لە قسەكان بینیوەو دڵم خۆش بوو. پاش بەڕێكەوتنەوەمان ترسام بەو گفتوگۆ دوورودرێژە بێزارم كردبێت، بۆیە باسەكەم گۆڕی و ویستم كەمێك پشوو بدات، كەچی ئەو لەو

دونیایەی تێی کەوتبوو نەدەهاتە دەرەوە یان خۆی نەیدەویست بێتە دەرەوە، بە ڕوخساریدا دیاربوو لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدایە.

دیسان چاوی هەموو سەرنشینەکانی تر هاتنەوە سەر ئێمە. چاوەڕێ بوون چی زووە دەست بکەینەوە بە گفتوگۆکە. ئەم بێدەنگییە زۆری نەخایاندو هاوڕێکەم بە پرسیارێك شکاندی:

ـ مامۆستا گریمان خوا هەیەو بوونەوەرانی دروست کردووە، ئەوکاتە خوا خۆی چۆنی بووە؟ کێ ئەوی بەدیهێناوە؟

چونکە پێشتر چاوەڕێی ئەم پرسیارە بووم، زەردەخەنەیەك گرتمی. هاوڕێکەم بە هەڵە لەم زەردەخەنەیەم تێگەیشت.

ـ مامۆستا لەوانەیە ئەم پرسیارانە نامۆ و هەڵە بن سەبارەت بە تۆ، بەڵام تکادەکەم لە گۆشەنیگای منەوە بڕواننە مەسەلەکە. ئێوە مرۆڤێك دەگێڕن بە دنیایەکدا پێشتر هیچ شتێکی تری نەدیتووە. من ڕێبوارم لەو جیهانەدا کە تۆ پێی ئاشنای، لەبیرت نەچێت تۆ دەستت گرتووم و پێم دەناسێنیت.

ئەم قسانەی هاوڕێکەم زۆر کاری تێکردم و بەکوڵ لە خوا پاڕامەوە ڕێنموونی بکات، بیرمدێت ئەم نموونەیەم بۆ هێنایەوە:

ـ گریمان شەمەندەفەرێکی هەشتا فارگۆنیمان هەیە. هەر فارگۆنە و ئەوی پێش خۆی ڕایدەکێشێت، بەڵام کە لە کۆتایی دا کار گەیشتە سەر ئەوەی کە ماتۆڕی بزوێنەر شەمەندەفەرەکە دەخاتە جووڵە، ئیدی ناتوانین بڵێین: "ئەی ماتۆڕەکە چی ڕایدەکێشێت؟".چونکە

ئەگــەر مــاتۆڕێکی ڕاکێشــەر لەهــەمان کاتــدا ڕانەکێشــراو نــەبێت، شەمەندەفەرەکە ناکەوێتە جووڵەو هاوسەنگی تێکدەچێت.

سەرباز فەرمان لە عەریف وەردەگرێت، ئـەویش لـە کـاپتن و، لـە کۆتایشدا سـەرکردەی گشـتی فـەرمان لـە پادشـا وەردەگرێـت، ئیـدی ناتوانین بپرسین: "ئەی پادشا لە کێ فەرمان وەردەگرێت؟". چونکە ئەگەر پادشـاش لـە یـەکێکی تـر فـەرمان وەربگرێـت، ئەوکاتـە نابێتـە پادشا. یەکێك لە خەسڵەتەکانی پادشابوون ئەوەیە کە فەرمان دەدات بێ ئەوەی فەرمانی بەسەردا بکرێت.

لـەم نموونانـەوە دەردەکـەوێت کـە بـوونی خوایـەکی بەدیهێنـەرو بەدینەهێنێراو پێویستە بۆ ڕاپەڕانـدنی کاروبارەکـانی ئـەم گەردوونـە، چــونکە لــەدایك بــوون و نەوەخســتنەوە دوو خاســیەتی تایبــەتی زینــدەوەرانن، نابێــت بــەدوای ئــەم یاســایەدا بگــەڕێین لــە خــوای دروستکەردا.

هاوڕێکەم بێ کاردانەوە بوو، گەنجەکـەی دواوە بـۆ جـاری دووەم هەڵیدایەوە:

- ئەی خوا پێش ئەوەی گەردوون دروست بکات لە کوێ بوو؟

- بۆچوونی هەڵەی ئێمە دەربارەی "کات" و "ئەزەلییەت"، وامان لێـدەکات ئـەم پرسـیارە هەڵەیـە بکـەین. کـات چـەمکێکە لەگـەڵ بـەدیهاتنی گەردوونـدا دروسـتبووەو لەگـەڵ بوونـەوەرانیش بـەردەوام دەبێت، واتە کاتیش لەگەڵ دروستکراوانی تردا بەدیهاتووە.

سەبارەت بە ئێمەی دروستکراو کات دەبێتە سێ بەشەوە کە هەریەك لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو دەگرێتەوە. بەڵام لە ئەزەلیەتدا ئەم دابەشکردنە ناکرێت. جگەلەوەش ناتوانین سەرەتایەك بۆ ئەزەلیەت بڕیاربدەین. ئەزەلیەت تایبەتە بە خوا کە لەدەرەوەی کات و شوێنە. کاتێکیش دەڵێین خوای گەورە ئەزەلییە، واتە سەرەتا و کۆتایی نیە.

خوای باڵادەست ئەزەلییە، کاتیش لەگەڵ دروستبوونی گەردووندا بەدیهاتووە، پێش ئەمە کاتیش نەبووە: کەواتە پرسیارێکی واش سەبارەت بە خوا ناکرێت. بەڵام دەتوانین بڵێین: "خوای ئەزەل و ئەبەد لە ئەزەلدا چی دەکرد؟"، زانایەکی پایەبەرز لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەفەرموێت: "خوای گەورە لە ئەزەلدا تەماشای کەماڵ و دەسەڵاتی شکۆمەندی خۆیی دەکرد کە هیچ پلەیەك لەسەروو ئەوەوە نییەو خۆییەو پێویستی بە یارمەتی هیچی تر نیەو پاك و بێگەردە لە هاوەڵ. خوای گەورە لە ئەزەلدا و لە بازنەی زانستی خۆیدا تەقدیری سیفاتە پیرۆزەکانی و ئەو ماددانەی کە ئەم ناوە قودسییانەیان تێدا دەدرەوشێتەوە و حەقیقەت و ماهییەت و پێناسە و شێوەی ماددی و مەعنەوییانی دەکرد. ئەم تایبەتمەندیەی کە خاسیەتێکی خواییە، مەحاڵە عەقڵی لاواز و دەستەوسان و کۆڵەواری مرۆڤ بتوانێت دەرکی پێبکات. مرۆڤێك کە تێگەیشتن و دەرککردنی وابەستەی کات و شوێنە، چۆن دەتوانێت لە نهێنیەکانی جیهانی ئەزەل تێبگات؟!"

گفتوگۆکـەمان بـەم جـۆرە بـەردەوام بـوو. دواتـر باسـی ئـەو بابەتانەمان کرد کە پێویستیان بە ڕوونکردنـەوەی لـۆژیکی هەیـە وەك زیندووبوونەوەو قەدەرو فریشتەکان و بە وەڵامی کورت کـورت لەسـەر هەموویان دواین، بەتایبەتی لەسەر تیۆرییەکەی داروین زۆر وەستاین.

باسـێکی تـریش کـە هاوڕێکـەم زۆر گرنگـی پـێ داو پێـداگربوو لەسەری بریتی بوو لە: "هـۆی بـەدیهێنانی خراپـە و ناشـیرینییەکان و تەرخانکردنی شەیتان بۆ مرۆڤ، کە بەمە زۆرێك ڕێیان لێ هەڵە دەبێت و دەچنە دۆزەخ. ئایا میهرەبانی و دادگەری خواوەنـد چۆن بەمـە ڕازی دەبێت؟" بە سوود وەرگرتن لە بەرهەمەکانی زانای پایەبەرز سەعیدی نوورسی، زۆر بە ئاسانی وەڵامی پرسـیارەکانی هاوڕێکـەم و سـەرجەم سەرنشینەکانی تری ناو پاسەکەم دەدایەوە. ئێستا لە نرخ و گەورەیی ئەم ڕاڤەیەی قورئان باشتر دەگەیشتم کە خوای گەورە لە ئاخرزەماندا بـە دیـاری بـە موسـوڵمانانی بەخشـیوە. کـە وەڵامـی ئـەو پرسـیارەم دایەوە کە سەبارەت بە هۆکـاری بـەدیهاتنی شـەیتانەکان کردبوویـان، ڕووناکی قایلبوونم لە ڕووخسـاریاندا بـەدی کـرد، هـەوڵێکی زۆرم دەدا بەر لە فرمێسکەکانی چاوم بگرم کە پەلەیان بوو بڕژێنە سەر ڕومەتم.

سوپاسی بێ پایانی خوا دەکەم کە بە درێژایی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە گرانانە، چی نموونە و بەڵگە و ڕوونکردنـەوەم خوێنـدبووەوە تا ئـەو کاتـە دەربـارەی ئـەو باسـانە، وەك فیلمێـك دەهاتنـەوە پـێش چاوم. کاتێك ئەو ڕاستیانە لە زارمەوە دەهاتنە دەر دەتوت مـن نـیم و خۆشم سوودم لە قسەکان وەردەگـرت. خـوای گـەورە لـە سـەختترین

کاتدا هات بە فریامەوەو ویستی شکۆمەندی ئەم ڕاستییانە لەبەرامبەر پیاوێکی زیرەك و ڕۆشنبیری مارکسیدا، بە هەزارێکی لاوازی وەك من بپارێزێت. بە درێژایی ئەو گفتوگۆیە زۆر خۆم دەپاراست لەوەی بەرامبەرەکەم بشکێنم، بیترسێنم یاخود کەشێکی موناقەشەو بگرە و بەردە بنێمەوە، چونکە هەر لە سەرەتاوە وتە بەنرخەکەی مامۆستا نوورسیم کردبوو بە ڕابەری خۆم کە دەفەرموێت: "سەرکەوتن بەسەر کەسانی مەدەنی ئەم سەردەمەدا بە بەڵگە و قایلکردن دەبێت نەك بە زۆر". بۆیە لە بارودۆخێکدا ئەگەر هاوڕێکەم تووڕە ببوایە من بە ڕوویەکی خۆشەوە وەڵامم دەدایەوە و دۆخەکەم نەدەشڵەقاند. بە توندی خۆم لە خۆبەشتزانین و لوتبەرزی بەدوور دەگرت. بێگومان ئەمەش بەهرەیەك نەبوو هی خۆم بێت، بەڵکو لە "قورئان"ەوە وەرمگرتبوو.

## درێژەی دەمەتەقێی ناو ئوتومبێلەکە

تا گەراجی ئەدەنە دەمەتەقێکەمان بەم شێوەیە بەردەوام بوو. تا ئێرە تیشکمان خستبووە سەر هەندێك لایەن، بەڵام هێشتا زۆربوون ئەو باسانەی پێویستییان بە ڕوونکردنەوەی زیاتر بوو. هاوڕێکەم گەشتەکەی لێرەدا تەواو دەبوو، ئەو لە ئەدەنە[1] دەمایەوەو من تا هەتای[2] ڕێگەکەم درێژ دەبۆوە.

---

١- شارێکی تورکیایە.

٢- شارێکی تورکیایە.

لـه دڵمـا دەمـوت خۆزگـە ڕازی دەبـوو ئەمشـەو لێـرە بەیەکـەوە بماینایەتـەوە و بـەردەوام بووینایـە لەسـەر باسـەکەمان، لـەو کاتـەدا هاوڕێکەم لێی پرسیم:

- بۆ کوێ؟

- وەکو دەزانیت من تا هەتای دەڕۆم.

برۆکانی وەك کەوان گرژبوو و قسەکەی پێ بڕیم:

- نەخێر، بۆ یەك شوێن ناڕۆیت، ناهێڵم لە دەستم دەرچیت، ئـەم باسـە گرنگانـە چـۆن دەبـێ نیوەناچـڵ بمێننـەوە؟ مێشـکم تێکـەڵ و پێکەڵ بـووە، چیتر بەرگـەی ئـەم کێشمەکێشـە نـاگرم، هـەر دەبێـت بگەینە ئەنجامێك.

زۆر دڵخۆشبووم بەم داوایەی هاوڕێکەم، بەڵام دەرم نەخست:

- بە یـەك مـەرج، ئەگـەر ئەمشـەو میـوانی مـن بیـت دەمێنمـەوە، ئەگینا ناتوانم داواکەت قبوڵ بکەم.

هیچ کەللەڕەقی نەنواند:

ــ گـرنگ نیـە کـێ دەبێتـە میـوانی کـێ، گـرنگ بـەردەوامی باسـەکەمانە. ڕێکـەوتین، نیـازم وابـوو بیبـەم بـۆ شـوێنێك کـە خـۆم دەمەوێت. ئینجا دوای ئەوەی هاوڕێکەمم ڕازیکرد، بیرم لەو دۆسـت و ناسیاوانە کـردەوە کـە لـەو شـارەدا دەیانناسـم. ئـەو یـەکێك بـوو لـە مەردان و ناسراوانی بیروبۆچوونی مارکسیزم، بۆیە نەمـدەتوانی هـەروا بیکەم بە شوێنێکدا یـان بـە ئوتێلێکـدا. نـەدەکرا هەموونـەو دۆسـت و

برادەرانـەش کـە دەیانناسـم لـەو شـارەدا لێـی کۆبکەمـەوە، چـونکە لەوانەیە بیترساندایە یاخود تووشی دڵـەڕاوکێ و دوودڵـی بکردایـە. لـە هەمووی باشتر ئەوەیە بیبەم بۆ ماڵی هاوڕێیەکم کە هەمیشە بـە مـاڵی خۆمم زانیوە. دەبوو کەسی کـە بێجگـە لـە خـاوەن ماڵەکـە لەگـەڵمان نەبووایە نـەوەك میوانەکـە بێـزار ببێـت. تەلـەفونم کـرد بـۆ دۆسـتێکی ئەندازیارم و بە کـورتی مەسـەلەکەم تێگەیانـد، هـەر زۆری پـێ خـۆش بوو، وتی: "لە گەراجەکە نەجوولێن، هەر ئێستا بە تەکسییەك دێم بـە شوێنتاندا".

چاوەڕوانیمان دەکرد و بە کەلای چاو سەیری هاوڕێکەمم دەکـرد. چەند تێبینییەکی لەسەر پارچەیەك کاغەز دەنووسی. دواتر تێگەیشتم کە لیستی ئەو پرسیارانەبوو دەیویست بیپرسێت، لیستەیەکی شەست پرسـیاری! بـانگی ئێـوارەی فـەرموو برادەرەکـەم گەیشـت. "ئـەو پیـاوە"ی هەمیشـە زەردەخەنـە لەسـەر لێـوانی بـوو دەیبەخشـی بـە دەوروبەری و جاران زۆر خوێنگەرم دەهاتە پێش چـاو، ئێسـتا کـش و مات دەتوت لە جیهانی ناخی خۆیدا نوقم بووە، ئەمە نیشانەی یەکـەم بەریەك کەوتنی بوو لەگەڵ خۆیدا.

کە گەیشتینە ماڵەکە، هێشـتا قـەیتانی پێڵاوەکانمـان نـەکردبۆوە کە هاوڕێکەم دەستی پێکرد:

- باسی زیندووبوونەوەمان کرد دوای مردن، بەڵام بە ڕای من ئەوە مەحاڵە، چونکە جەستەمان لـە خاکدا دەپووکێتـەوە. گەردیلـەکانمان

باو لافاو و ئاژەڵان پەرش و بڵاوی دەکەنەوە، بەم جۆرە هەموو شتێك تێکدەچێت بەسەر یەکدا، تۆش هەستاویت و دەڵێیت دوای مردن زیندوو دەبینەوە؟ زۆر سەرمان لەم پرسیاری بەردەرگایە سووڕما. لە مێشکیدا ئەوەندە پرسیار دەهاتن و دەچوون، لەپڕ یەکێکیان بێ کۆنترۆڵ خۆی هەڵدەدایە دەرەوەو ئارامگریش فریای ئەوە نەدەکەوت دەرگاکە دابخات. "ئەو پیاوە" ئێستا لە ناوەڕاستی ململانێی نێوان ڕاست و هەڵەدا بوو. خاوەن ماڵ پێش من کەوتە خۆی:

- خەمتان نەبێت بەڕێزم، با جارێ بچینە ژوورەوەو هەناسەیەك بدەین، ئینجا نانێکی باشی لێ بخۆین، دڵنیابن زۆر شت ڕوون دەبێتەوە، هیچ خەمێکتان نەبێت.

دوای ئەوەی لەگەڵ برادەرەکەم لە ژوورێکی تر پێکەوە نوێژمان کرد، سفرەو خوان ئامادەبوو، چامان بەسەردا کردو هێندەی نەبرد خۆمان لە ناوەڕاستی پرسیارەکاندا دیتەوە. خۆ "ئەو پیاوە" هۆش و گۆشی لای پرسیارەکان بوو. دەستی برد لیستەکەی گیرفانی دەرهێنا، تەنانەت نەیدەتوانی ئەوەندە چاوەڕێ بکات سفرەکە هەڵگیرێت.

- ئەمڕۆ بۆ من ڕۆژێکی زۆر گرنگە، لەوانەیە بۆ ئێوە ئاسایی و هەروا سانا بێتە بەرچاو. لە ژیانمدا بەشداری چەندەها کۆبوونەوەم کردووە، لەگەڵ چەندەها کەس و تاقم و کۆمەڵدا گفتوگۆم کردووەو بەرگریم لە بۆچوونەکانم کردووە. کاتی وا هەبووە لەگەڵ هەرە ناسراو

و گەورەکانی مارکسیزم لە جیهاندا دانیشتووم و باسی گرێ کوێرە و چەمکە ئاڵۆز و نەکراوەکان و ئەو لایەنانەی مارکسیزمم کردووە کە ڕووبەڕووی پرسیار و ڕەخنە دەبنەوە، توێژینەوەم لەسەر ئەو شتانەی مارکسیزم دەکرد کە خەڵك بەدڵیانە یاخود بە کاری ئەوان ناخوات. چەندەها کۆڕم لەسەر ئەوە گرتووە چۆن بتوانین مارکسیزم بگونجێنین لەگەڵ ئەم سەردەمەدا، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا چەپڵەیان بۆ لێ داوم و بە شان و باڵمدا هەڵیان داوە، لە وڵاتانی دەرەوە بە تایبەت لە وڵاتە سۆسیالیستییەکاندا تەنانەت لەبەردەم سەرکردە هەرە گەورەکاندا ئەوەی بەڕاستم زانیبێت بێ دوودڵی نەڕاندوومە و ستایش کراوم و بردوویانم بە ئاسماندا. دەمەوێت دان بەو ڕاستییەدا بنێم کە هیچ یەکێك لەو ڕۆژە پرشنگدارانە، وەکو ئەمڕۆ ئەم جۆش و خرۆشەیان پێ نەداوم. هەرگیز وا تێنەگەن ئەمە زیادەڕەوی یان خۆهەڵنان بێت.

نیو سەدەیە خزمەتی ئەم بانگەوازە دەکەم، دان بەوەدا دەنێم کە گەشتێکی دوو سێ سەعاتی ناو پاسێك و ئەو گفتوگۆ کورتە وای لێ کردم بە هەموو باوەڕ و بۆچوونەکانمدا بچمەوە و هەڵوێستەیان لەسەر وەربگرم، گەیشتنمان بە گەراجی ئەدەنە لە هانا بردن بۆ فریادڕەسێك دەچێت.

تا ئێستا ڕاهاتبووم مارکسیزم وەك تاکە چارە و کۆتا ڕێگا ببینم، کەچی ئەمڕۆ لەناو ئەو پاسەدا هەستم بە سەنگینی بۆچوونێکی تریش

کرد، لەبەرئەوە بە خۆمم وت: ئەگەر بۆچوونێك هەبێت مارکسیزم لاواز بکات دەبێت هەرچۆنێك بووە بیزانم، بە ڕاکردن لێی ڕزگارم نابێت. ئەمڕۆ گوێی خۆم لێ کەڕ کرد، سبەینێ لە شوێنێکی تردا هەر دێتەوە ڕێم. بۆیە دەبێت وردەکارییەکانی ئەم پەیامە بزانم کە خۆی وەك جێگرەوەیەك "بەدیلێك" دەردەخات لەبەرامبەر مارکسیزمەوە. بە ڕای من پێویستە هەر خاوەن بیرێك پێوەرێکی هەبێت، ئەم پێوەرەش دەبێت هەموو ئەو بۆچوونە جوان و لێکدانەوە ڕاست و دروست و بەدیلە شیاوەکان بە سنگێکی فراوانەوە قبووڵ بکات. بە پێچەوانەوە دەمارگیری و کۆنەپەرستی فیکری دێتە مەیدان و ئەوکاتە کەس ناتوانێت شتێك بۆ بەرامبەرەکەی باس بکات. ئەمەش ڕێی گەیشتنمان بە باشترین ڕاستی دەگرێت. ژیری دەمکوت دەکات و بڕیاری پێش وەخت و هەستەکان دێنەگۆ. ئەگەر یەکێك شتێکم بۆ باسبکات کە زۆر پێویستیم پێیەتی، دەبێت من سوپاسی بکەم، چونکە ڕاستییەکی ئامادەکراو و پوختی خستۆتە بەردەستم. لە ناو ئەو پاسەدا ئەم برایە ئاماژەی بە چەند ڕاستییەك کرد کە من تینوویان بووم، درز کەوتە دەرگاکانی دنیا داخراوەکەم. ئێستا مێشکم دەڵێی مەیدانی جەنگە، تیایدا شتان لێڵ و بەسەر یەکدا چوون. دەمەوێت ئەمشەو یەکلایی بکەمەوە و ڕزگارم بێت. هەموو کاتێك کەشێکی وام دەستگیر نابێت، من بە سنگێکی فراوانەوە گوێتان لێ دەگرم و هیواداریشم ئێوەش هەروا بن.

لەم کاغەزەدا لیستێکی پرسیارم نووسیوە، ئەوانەیە کە هاتوون بە مێشکمدا، شەست دانەیەك دەبن... لەوانەیە بۆ ئێوە دووبارە و سانا بن بەلاّم بۆ من پەیوەندی بە هەموو ژیانمەوە هەیە، یان ئاسۆیەکی نوێم بۆ دەکاتەوە یان کۆنەکانیش دادەخات.

خاوەن ماڵەکەمان بەو زەردەخەنە شیرینەیەوە وەلاّمی دایەوە:

- بەڕێزم با دەست بە پرسیارەکان بکەین، بەلاّم یەك داوام هەیە لە جەنابتان، با وەك دوو هاوڕێ و دوو دۆست درێژە بە گفتوگۆکەمان بدەین. هاوڕێکەم:

- ئێ خۆ منیش هەر ئەوەم دەوێت، جارێکی تریش دەیڵێمەوە کە هەمیشە دوژمنێکی زانام لە دۆستێکی نەزان بەلاوە باشتر و بەڕێزترە، وابزانم ئەمەندە بەسە. میوانەکەمان دیسان سەلماندی کە چەند دنیادیدە و ڕۆشنبیر و حەقپەرستە، بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی:

- مامۆستا دەمەوێت دیسان بچینەوە سەر باسی یەکەممان کە لە ناو باسەکەدا شەن و کەومان کرد. ئایا مەرجە ئەم گەردوونە خوایەکی هەبێت، ئایا ناکرێت بێ ئەویش بوونەوەران هەبن؟ دەبێت بچینەوە سەر بناغەی ئەم باسە، چونکە هەموو بابەتەکانی تر دێنەوە سەر ئەم باسە، هەتا ئەمە یەکلایی نەکەینەوە ناتوانین لە مەسەلەکانی تر بدوێین و باسیان بکەین.

## ئەم گەردوونە دەستکردی کێیە؟

قسەکانی زۆر تەواو بوو، هەموو بۆچوونەکان سەبارەت بە گەردوون دەهاتنەوە سەر بوون یان نەبوونی (حاشا) خوا. کەوایە دەبێت لێرەوە دەست پێبکرێت، لەبەر ئەوە پێویستە یەکتاپەرستی چەق و قورسایی باسەکەمان بێت. "پەیامی سروشت"[1]م کردەوە کە پەرتووکێکی بێ وێنەیە لەم بوارەداو دەستمان کردە خوێندنەوەی. کتێبەکە ئەو چوار گریمانە ڕیز دەکات کە بە پێی تەرازووە عەقڵییەکان دەگونجێت گەردوونیان دروست کردبێت.

یەکەم: ڕێکەوتەکان بوونەوەرانیان دروست کردووە.

دووەم: گەردوون لە خۆیەوە دروست بووە و لە خۆشیەوە تەواو دەبێت.

سێیەم: سروشتییە، واتە سروشت بەدیهێناوە.

چوارەم: ئافەرێنراوی خوایەکی تاکی پاك و بێگەردە.

بەڵێ، مادەم بوونەوەران هەن و ناتوانین نکووڵی لە بوونیان بکەین، جگەلەوەش شتان بەوپەڕی ناوازەیی و ڕێکوپێکی و دانایی دێنە ئەم بوونەوە. ژیری پێمان دەڵێت کە لەم چوار ڕێیە زیاتر نیە بۆ دۆزینەوەی خاوەنی گەردوون، ئاژەڵێك یان:

- بە کۆبوونەوەی هۆکارەکان دێتە بوون.

---

١- پەیامی سروشت دانراوی زانای گەورەی کورد مامۆستا (سەعیدی نوورسی)یەو بەڕێز (فارووق ڕەسووڵ یەحیا) کردوویە بە کوردی.

- یاخود خۆی لە خۆیەوە دروست دەبێت.

- یان لە ژێر کاریگەری سروشتدا بەدیدێت.

- یان توانستێکی خودایی بە زانست و توانستی خۆی بەدیهێناوە.

مادەم بە گوێرەی تەرازووی ژیری جگە لەم چوار ڕێگەیە شك نابەین، کەواتە ئەگەر بێت و پووچەڵیی سێ ڕێگەی یەکەم بسەلمێنین، ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها ڕێی چوارەمە، واتە بەمە ئەوە دەسەلمێنین کە خوای گەورە خاوەنی گەردوونە.

"ئەو پیاوە" ئەم ڕیزبەندییەی زۆر بە دڵ بوو:

- پێشەکییەکی زۆر جوان و ڕیزبەندییەکی ژیرانەیە. ئەگەر بە ڕاستی ئەوە بسەلمێنێت کە سێ ڕێگەی یەکەم هیچ کاریگەرییەکیان لە دروستبوونی گەردووندا نیە، ئەوا کێشەیەك نامێنێتەوە.

دەستم کرد بە خوێندنەوە:

ڕێگەی یەکەم: ئەو ڕێگایەیە کە دەڵێ: "کۆبوونەوەی هۆکانی جیهان دەبنە هۆی دروست بوونی بوونەوەران و ئەو شتانەی لە بوونەوەراندا هەن."

وەڵام: هەر دەرمانخانەیەك بگریت سەدان شووشەی پڕ لە ماددەی جۆراوجۆری تێدایە.. جا ئەگەر بێت و پێویستییەك هاتە ئاراوە بۆ پێکهێنانی هەویرێکی زیندەکاری لەو ماددە و دەرمانانە، وە پێویست بوو ماددەیەکی زیندەکاری دژ بە ژەهرەکانیان لێ پێك

بهێنرێت. با وا دابنێین پێویستییەکی وا ڕووی دا و بۆ ئەم مەبەستە ڕۆیشتینە ناو دەرمانخانەیەك..

جا کە چووینە ناو ئەو دەرمانخانەیە، چەندین جۆرمان لەو هەویرە زیندەکارییە و لەو ماددە زیندەیەی کە دژ بە ژەهرەکانە تیا دەستکەوت، پاشان کە دەستمان کرد بە شیتەڵ کردنی هەر کام لەو هەویرانە، بۆمان دەرکەوت کە هەریەکەیان بەوپەڕی وردییەوە لە چەند ماددەیەکی جیا جیای ناو ئەو شووشانە، وە بە پێی تەرازوویەکی دیاریکراو پێك هاتووە و پوختە کراوە: گرامێك لەم دەرمان و سیان لەم و شەش حەوتێ لەوی تر، بەم جۆرە و لە هەر کام لەو دەرمانانە ئەندازەیەکی تایبەتییان لێ وەرگیراوە، بە جۆرێك کە ئەگەر بهاتایە و بە ئەندازەی بەشێك لە یەك گرام زیاتر یان کەمتر بووایە ئەو ئەدگارە زیندەکارییەی تیادا پەیدا نەدەبوو..

پاشان ئەو ماددە زیندەکارییەی کە دژ بە ژەهرەکانە، هێنامان و لێی ورد بووینەوە، بۆمان دەرکەوت کە ئەویش بە چەند ئەندازەیەکی دیاریکراو و بە پێی چەند تەرازوویەکی هەستیار پێك هێنراوە، کە ئەگەر بهاتایە و بەقەدەر گەردێك زیاد یان کەم بووایە، ئەوا تایبەتمەندییەکانی خۆی لە دەست دەدا. واتە ئەو ماددە جیا جیایانە بە چەند ئەندازەیەکی جیا جیاو بە چەند تەرازوویەکی هەستیارو ورد ئامادە کراون. جا ئایا دەچێتە عەقڵی هیچ خاوەن عەقڵێکەوە کە ئەو هەویرەی ئاوا بەم چەشنە هەموو بەشێکی بە وردی

هەژمارکراوە "حساب کراوە" و لێك دراوەتەوە، بە هۆی ڕێکەوتنێکی سەیرەوە پەیدا بوو بێت، یان لە ئەنجامی هەڵگردنی ڕەشەبایەك بەسەر ئەو دەرمانخانەیەدا ئەو شووشانە کەوتبن بەسەر یەکداو ئەو ئەندازە دیاریکراوانەی ئاوێتەی یەکتر کردبێ و بەم جۆرە ئەو هەویرە زیندەکارییەی پێك هێنابێ؟ ئایا مەحاڵی لەمە سەیرتر و، ئەفسانەی لەمە خراپتر و، ناحەقی لەمە ناحەق و ناڕەواتر هەیە؟

جا با لە ڕووناکی تیشکی ئەم نموونەیەدا بڵێین: هەر زیندەوەرێك بگریت، بریتییە لە پێکهاتوویەکی زیندەکار و هەویرێکی خاوەن ژیان، وە هەر ڕووەکێکیش وەك دەرمانێکی زیندەکاری دژ بە ژەهران وایە، چونکە لە چەند بەش و ماددەیەکی جیا جیا و بە پێی چەند تەرازوویەکی تا بڵێی ورد و هەستیار پێك هێنراوە. هیچ گومانیش لەوەدا نییە کە گێڕانەوەی دروست بوونی ئەم زیندەوەرە جوان و پڕ لە ووردەکارییە، بۆ ماکەکان و هۆ ماددییەکان، شتێکی بەتاڵ و مەحاڵ و نەگونجاوە و لە هەموو تەرازوویەکی عەقڵییەوە تا بڵێی دوورە، بە چەشنی مەحاڵیی پێك هاتنی ئەو هەویرە زیندەکارە لە ڕێگای تێکەڵ بوونی ئەو ماددانەی ناو شووشەکان لە خۆیانەوە".

بۆ ئەوەی زیاتر ڕوون بێتەوە، دووبارە نموونەکەمان خوێندەوە، چونکە لە دەستەواژە عوسمانیەکان بە باشی شارەزا بوو، بە ئاسانی لە نموونەکە تێگەیشت، ویستم باسەکە زیاتر دەوڵەمەند کەم بۆیە وتم:

- با دەرمانێکی دژە ئازار یان حەپێکی ڤیتامین بە نموونە بهێنینەوە، ئەم حەپە لە چەند ماددەیەکی جیاواز و بە پێی چەند ئەندازەیەکی ورد پێك هێنراوە، ئەگەر یەکێك لەو ماددانە بە حاڵ کەمتر یان زۆرتر بێت لە ئاستی ئاسایی خۆی، ئەو کاتە خاسیەتەکانی دەرمان و شیفا بەخشین لە دەست دەدات و بگرە لەوانەیە زیان بە جەستەش بگەیەنێت. با وای دابنێین ئەو ماددانەی دەرمانەکەیان پێك هێناوە بە جیا لە چەند شووشەیەکدان و لەسەر ڕەفەیەك دانراون، ئایا ڕێی تێدەچێت ئەم شووشانە بکەونە خوارەوەو مادده ڕژاوەکان بێن تێکەڵی یەکتربن و دەرمانە شیفابەخشەکە دروست کەن؟ ئایا ئەمە لەگەڵ ژیریدا دەگونجێت؟

میوانەکەمان زەردەخەنەیەك گرتی:

– هەرگیز، ئەوەی باوەڕ بە شتێکی وا بکات، هەڵبەتە ژیری و زانستی لە خۆی داماڵیوە.

- با لە نێوان ئەو هەموو بەخششانەی خواوەندا کە بەخشیویەتی بە مرۆڤ و خستوویەتیە ژێر فەرمانییەوە، دانەیەکیان بۆ نموونە هەڵبژێرین و لە حیکمەتە ورد و دانسقە ناوازەکەی لە دروست کردنیدا بڕوانین. لە سێو بڕوانە کە بە سیما شیرین و زەردەخەنە دڵڕفێنەکەی بانگمان دەکات و داوەتی خواردنیمان دەکات.

زانست پێمان دەڵێت کە ڤیتامینەکانی تەنها یەك سێو بەشی پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژێکی مرۆڤێك دەکات، ئەو هێزەی زانایە بە

چییەتی "ماهیەتی" مرۆڤ، سێوی بەم چەشنە بەرنامەڕێژ کردووە، سێو هەم ڤیتامین سی و هەم کانزای ئاسنی تێدایە. ئەگەر ئاسنەکە نەبێت دوای ماوەیەك ڤیتامینەکە دەگەنێت، لە لایەکی ترەوە سێو ڕێژەیەکی زۆر لە ترشی تێدایە کە بەرپرسە لە پاراستنی ڤیتامینەکە، ئەم ترشییە ترشی ناو گەدە زیادەکات و زیان بە بەرگی ناوەوەی دەگەیەنێت، لەبەر ئەمە ئایۆنی کاربۆن کراوەتە سێوەوەو ناهێڵێت ئەم زیانە ڕووبدات. کە سێوێك دەخۆین بە دوایدا قرقێنە لێ دەدەین، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەو بۆ ئایۆنەکانی کاربۆن کە لە پێکهاتەی سێودان، بەم جۆرە سێوێك هاتە مەیدان کە زۆر سوودبەخشە و تەبایە لەگەڵ مرۆڤدا. مادده و هۆ بێ گیان و بێ هەستەکان لە کاتێکدا مرۆڤ ناناسن و ئاگایان لە ئارەزوو و داواکانی نیە، چۆن دەتوانن بەرهەمێکی وا نایاب و بەسوود دروست بکەن کە لەوپەڕی تەبایی دا بێت لەگەڵ جەستەی مرۆڤدا؟

دوو نموونەکەی تریشمان لە پەیامەکە خوێندەوە کە هەر لەسەر مەحاڵیی ڕێگەی یەکەم دەدوێن. میوانەکەمان وتی:

- ئەمەندە بەسە.

ڕێگەی دووەم: کە بانگەشە بۆ لە خۆوە دروست بوونی شتان دەکات.

وەڵام: ئەم جەستەیەی تۆی مرۆڤ، وەك کۆشکێکی گەورەی ئاوەدان وایە کە هەزار و یەك گومەزی تێدابێت و، هەر یەك لەو

گومەزانەش بە تۆکمەیی و بێ هیچ ستوونێك یەکیان گرتبێت و چەندین بەردیان پیا هەڵواسرابێت. تەنانەت جەستەی تۆ -گەر سەرنجی بدەیت- هەزاران ئەوەندەی ئەم کۆشکە سەرسووڕهێنەر ترە، چونکە کۆشکی جەستەت هەمیشە ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت و بەرەو جوانتر دەڕوات و زۆر بە ڕێکوپێکیش لە تازەبوونەوەدایە.

خۆ ئەگەر هیچ سەرنجێك لە "گیان" و "دڵ" و هەستە ناسکە واتایی "مەعنەوی" یەکانی تر نەدەین کە لە تۆدا دانراون، کە هەریەکەیان دەرئاسایەك "موعجیزەیەك"ی سەربەخۆن بۆ خۆیان، بەڵکو تەنها یەك ئەندام لە نێوان ئەندامە ئاشکراکانی جەستەتدا بە نموونە بهێنینەوە، ئەوا دەبینین ئەو ئەندامە وەك خانوویەك وایە کە چەند گومەزێکی تێدابێت، چونکە ئەو خانانەی کە لەو ئەندامەدان وەك بەردی گومەز بەوپەڕی ڕێکی و جوانی و وردەکارییەوە یەکیان گرتووە و تەلارێکی گەلێ ناوازەو جوانیان پێکهێناوە و، بەمەش یەکێك لە موعجیزەکانی توانستی خواوەندیان -وەك "چاو" یان "زمان"- دەرخستووە. جا ئەگەر ئەم خانانەی لەشت لە لایەن خوای گەورەوە کاریان پێ نەسپێررابێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواوەندی بەدیهێنەر نەبن، دەبێ هەریەك لەو گەردیلانە فەرماندەی ئەوانی تر بێت و لە هەمان کاتیشدا لە ژێر فەرمانیاندا بێت! واتە لە ڕوانگەی دەسەڵات و فەرماندەییەوە لەوانی تر بچێت و لە هەمان کاتیشدا دژیان بێت! هەروەها دەبێ زۆربەی ئەو تایبەتمەندێتیانەی کە تەنها

شایستەی خوای گەورەن، لەو گەردیلەیەدا ببن و، هەموو یەکێك لەو گەردیلانە سەربەست و دەست بەستراویش بن لەیەك کاتدا!

جا هەرکەس خاوەنی هێندەی گەردیلەیەك هەست و شعوور بێت، دەزانێت کە هەرگیز ناگونجێت بەدیهێنانی ئەو بەدیهێنراوە ڕێکوپێکەی کە بە هۆی نهێنی "یەکتایی"یەوە یەکێکە لە شوێنەوارەکانی تاك و تەنیایی بەدیهێنەر، بدرێتە پاڵ چەندین خانەی زۆرو لەژمارەبەدەر. تەنانەت کە بیر لەمە دەکاتەوە سەد مەحاڵی تێدا دەبینێت".

ڕستە بە ڕستە نموونەکەمان بۆ ڕوون کردەوە:

- نموونەکەی سەرەوە مرۆڤ دەچوێنێت بەو کۆشك و گومەزانەی لەسەر دەستی ئەندازیارە زیرەك و ژیرەکان بنیات دەنرێن و، بەڵکو بە هەزاران جار لەو تەلارانە ناوازەترو جوانترە چونکە هەردەم لە ئاڵوگۆڕدایە و لە لایەك خانەکان دەمرن و لە لایەکی تر زیندوو دەکرێنەوە. سەرەڕای ئەم تازەبوونەوە هەمیشەییە، خانەکان بە پێی چەند تەرازوو و ئەندازەیەکی هەستیار دەچنە پاڵ یەك و ئەندامگەلێکی وەك چاو و زمان پێك دەهێنن. لە کاتێکدا ئەم کارەی ئەوان دەیکەن پێویستی بە پلان و پرۆگرامەو بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانیان فەرمان بەسەر یەکتردا دەدەن و لە هەمان کاتدا دەچنە ژێر فەرمانی ئەوانی ترەوە. بە کورتی ئەگەر گەردیلەکان بتوانن بەم کارە دەرئاسا و نایابە هەستن، ئەوا هەر یەکێکیان دەبێت خوایەکی

بچووك بێت و زانست و توانست و حیكمەتێكی خوایانەیان هەبێت.
ئاشكرایە كە گێڕانەوەی بوونەوەران كە لەوپەڕی جوانی و ڕێكوپێكیدان، بۆ چەند گەردیلەیەك كە لەوپەڕی بێ هەستی و دەرك نەكردنداں، كاری مرۆڤی ژیر نیە. چەند جارێك ئەم نموونەیەمان شیكردەوە تا گەیشت بە ڕووناكی، لەگەڵ ئەوەشدا مۆڵەتمان خواست و دوو نموونەكەی تریشمان لەسەر هەمان بابەت خوێندەوە، جگە لەوەش باس چووە سەر پێكهاتەی خانەكان و ناوكەكانیان و ئەو كۆمپیوتەرە خواییانەی پێیان دەڵێین (DNA) و هەوڵماندا دەریبخەین كە هەرگیز ئەم یاسایانە ناكرێت هی خۆیان بێت.

لێرەدا خاوەن ماڵ وتی:

- نازانم بۆچی ئەوەندە بە وشكی وانە بە قوتابییان دەڵێنەوە.

ـــ پێویستە زانست لەگەڵ زاناكەیداو هونەر لەگەڵ هونەرمەندەكەیدا بخوێندرێت تا مرۆڤ باشتر لە خۆی بگات و پەی بە نهێنییەكانی دروست بوونی ببات، ئەگینا تەنها نرخی ماددەو گۆشت و ئێسقانەكەی دەمێنێتەوەو هیچ جیاوازییەكی لەگەڵ ئاژەڵاندا نابێت.
میوانەكەمان:

- بەڵێ، قسەكانتان تەواو ڕاستن.

ڕێگەی سێهەم: كە دەڵێ سروشت بوونەوەران پێك دەهێنێت.

وەڵام: جارێكیان مرۆڤێكی نەشارەزای جیهانی شارستانێتی و نەزان و دنیا نەدیو، دەڕواتە ناو سوپایەكی سامناكەوەو، لەبەردەم

ئەو مەشق و ڕاهێنانە گشتییەی کە سەربازەکانی سوپا پێکەوە دەیانکرد، دەحەپەسێت کە دەبینێت ئەوپەڕی ڕێکی و خشتی و گوێڕایەڵی پیشان دەدەن، پاشان سەرنج لەو جموجووڵە ڕێکخراوەیان دەدات کە دەبینێت سەرجەمی سوپا، چ تیپ و چ لیواو چ هێز، تێکڕا بە بزووتنەوەی یەك دانە کەس دەبزوونەوەو، بە بێ دەنگ بوونیشی بێ دەنگ دەبن و، هەرکاتیش ئەم یەك کەسە فەرمانی تەقەکردنی بۆ دەرکردن ئەوا هەموویان یەکسەر دەست بە تەقەو دەسترێژ دەکەن..

بەڵێ، ئەم مرۆڤە سەرنجی هەموو ئەمانە دەدا، بەڵام تێنەگەیشتن و کەودەنییەکەی وایان لێکرد کە هیچ شتێك لەبارەی فەرمانەکانی پێشەوایەتیی سوپا تێنەگات و پەی پێ نەبات، لەوانەی کە لە یاساکانی دەوڵەت و پادشادا دیاری کراون، لەبەر ئەم تێنەگەیشتنەی ئینکاریی سەرکردایەتیی سەرکردەی مەزنی کردو، بە ئەندێشەی خۆی پێی وا بوو ئەم سەربازانە بەهۆی چەند پەتێکی ماددی بەیەکەوە بەستراونەتەوە! پاشان بیری لەو پەتە ئەندێشەییە دەکردەوە کە ئایا دەبێ چەند سەیرو سەرسوڕهێنەر بێت؟ بەڵام لە ڕاستیدا خۆی گرفتاری سەرسامی و سەرسوڕمانی زیاتر کرد و بەو حاڵەوە سەربازگەی بەجێ هێشت و کەوتەڕێ! هەر ئەم مرۆڤە لە ڕۆژی جومعەدا ڕێی دەکەوێتە مزگەوتی گەورەی "ئەیاسۆفیا"، دەبینێت کۆمەڵی موسوڵمانان لە هەستان و دانیشتن و ڕکووع و سوژدەی نوێژدا گوێڕایەڵی دەنگی یەکێکیانن! جا لەبەر ئەوەی ئەم مرۆڤە لە

واتـا و نـاوەرۆکی "شـەریعەتی خواوەنـد" ـ کـە یاسـا مەعنـەوی و ئاسمانییەکانـە– تێنەدەگەیشـت و، هەسـتی بـەو دەسـتوورو یاسـا مەعنەویانە نەدەکرد کە لە فەرمانـەکانی خـاوەنی شـەریعەتدان، ئـەوا لای وابـوو کـە ئـەو جەماعەتـە، بـە چـەند پـەتێکی مـاددی بەیەکـەوە بەسـتراونەتەوە! گوایـە ئـەو پەتـە سـەیرانە کۆمـەڵی مزگـەوتی پەیوەستی یەکتری کردووەو، هەموو جموجووڵ و وەستانێکیشیان لـە ڕێی ئەو پەتانەوەیە! بەم جۆرە، ڕۆیشت و کەوتەڕێ و، ئـەم چەشـنە بیرکردنەوە بێ نرخ و نەزۆکانەشی لەگەڵ خۆیدا هـەڵگرت، کـە هێنـدە بێ بایەخە تەنانەت ئەو جرِوجانەوەرە درِندانەش کە لە شێوەو شـکڵی مرۆڤدان، گاڵتەی پێ دەکەن و بە مایەی شەرمەزاری دەزانـن! جـا لـە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە دەڵێین: بێ باوەرِێکی ملنـەدەر لەوانـەی کـە چەمکی سەرسەخت و تەواو نەزانانـەی "سروشـت"یان لەگـەڵ خۆیـان هەڵگرتووە، کاتێ دێنە ناو ئەم جیهانەی کە سـەربازگەیەکی بەسـام و شکۆ و جوانی سوپای پادشای مەزنـەو، مزگـەوتێکی گـەورە و ڕێـك و قەشەنگی ئەوتۆیە کە پەرستراوی ئـەزەلیی تێـدا پـیرۆز ڕادەگیرێـت.. کاتێ دێت و پەی بەو "یاسا مەعنەویانە" دەبات کـە ئاسـەوارەکانیان لە پەیوەست کردنی ڕێساکانی ئەم گەردوونە ناوازەیـەدا دەبینـرێن و، لە سەرچاوەی "دانست"ی ڕەها و بێ سنووری بەدیهێنـەری مەزنـەوە هەڵقوڵاون..ئەم مرۆڤە، سەرجەمی ئەو یاسـایانە بـە چـەند یاسـایەکی ماددی دادەنێت و، وەك چەند ماددەیـەکی ڕەق و تـەق دەیانبینێـت و

لەو ڕوانگەیەشیەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. هەروەها بە ئەندێشەی خۆی پێی وایە کە فەرمانەکانی یاساکانی پەروەردگارێتیی زاڵ و دەسەڵاتدارو گشتیی خواوەند، کە چەند یاسایەکی گوێرەیی و ئیعتیبارین و.. دەستوورەکانی شەریعەتی گەردوونیی خواوەندی پەرستراوی ئەزەلیش، کە چەند دەستوورێکی مەعنەوین و تەنها لە زانستی خوادا هەن و بوونیان هەیە، ئەم مرۆڤە، پێی وا دەبێت کە هەرکام لەو یاساو دەستوورانە بوونی دەرەکییان هەیەو چەند یاسایەکی ماددین. ئیتر دێت و ئەو یاسایانەی کە لە "زانست"ی خوا و "گوفتار"ی پەروەردگارەوە دەرچوون و تەنها "بوونی زانستی"یان هەیە (واتە لە زانستی خوادان) ئەم دێت و لە بری توانستی خوا دایاندەنێت و کاروباری بەدیهێنان و دروستکردنیان پێ دەبەخشێت و، پاشان ناوی "سروشت" یان بەسەردا دەبڕێت، ئینجا ئەو "هێز"ەش کە لەناو ئەم یاسایانەدایەو بریتییە لە درەوشانەوەیەکی "توانست"ی پەروەردگار، ئەم مرۆڤە بێباوەڕە بە "هێزێکی بەتوانای کاریگەر"ی دادەنێت و وەك "خاوەن توانستێکی سەربەخۆ" بۆی دەڕوانێت! جا ئایا کەودەنی و نەفامیی لەمە زیاتر هەیە؟ ئایا نەفامی و گەوجیی ئەم کەسە بە چەندین جاریش لە هی ناو نموونەکە زیاتر نیە؟"[1] دوو نموونەی تریشمان لەسەر ڕێگەی سێهەم خوێندەوە، خۆشی جاروبار

---

١- دەقی کوردی ئەم نموونانە لە وەرگێڕانەکەی بەڕێز فاروق ڕەسوڵ یەحیاوە وەرگیراوە.

هەندێك ڕوونكردنەوەی دەدا لەسەر تێگەیشتنی خۆی بۆ نموونەكە.
شێوازی خستنەڕوو بەهێزیی نموونەكانی زۆر بە دڵ بوو، هەتا وتی:

ـ وەڵام دەبێ ئاوا بێت، مرۆڤ تێر دەكات. پێویستە بابەت گەلێكی گرنگی لەم چەشنە لە دەمی كەسانی شارەزاو گرنگەوە ببیسترێن. دەبێت كەسەكە مۆڵەتی یاسایی هەبێت لەم بوارەدا، نازانم بۆچی مافی قسەكردن دەدەن بەو كەسانەی كە لەجیاتی ڕوونكردنەوە ئەوەندەی تر ئاڵۆزی دەكەن و سەر لە خۆیان و بەرامبەریش تێك دەدەن.خاوەن ماڵ وەڵامی دایەوە: زۆر ڕاستە بەڕێزم، بەڵام پاش دروستبوونی كۆمار ڕێ بە زانا ئاینییە ڕاستەقینەكان نەدراوە تا ئەم جوانییانە بۆ خەڵكی ئاشكرا بكەن، ئەوانەشی وێرابێتیان شتێك بڵێن هەزارەها بەڵایان بەسەر هێناون.

ویستم زیادەیەك بخەمە سەر كۆتا نموونە كە خوێندبوومانەوە، بۆیە ڕوخسەتم وەرگرت:

ـ سەرەتا دەبێت پێناسەیەك بۆ سروشت بكەین. سروشت ئاو و هەوا و گڵ و خۆرە، هەڵبەت ڕووناكی و گەرمیشمان لەبیر نەچێت. بە واتایەكی تر سەد و سیازدە توخمەكەیە، ئەگەر بێت و ئەم سروشتەی كە بە خوا دانراوە بیهێنین و ئەم پرسیارانەی ئاڕاستە بكەین:

ـ دەتوانیت مرۆڤ دروست بكەیت؟

ـ نەخێر.

ـ دەتوانیت ڕووەك و گیانداران بهێنیتە بوون؟

- نەخێر.

- دەتوانیت کۆمەڵەی خۆر بەڕێوە بەریت؟

- نەخێر.

- جڵەوی ئەستێرەکان و گەلەستێرەکان بەدەست تۆیە؟

- نەخێر.

- دەتوانیت یاسایەکی وا دابنێیت کە هەموو گەردوون بێ کەموکورتی و لەلوتکەی جوانی و ناوازەییدا هەڵبسووڕێنێت؟

- نەخێر.

کەواتە سروشت خۆی خودی گەردوونە، ئێ خۆ سەلماندیشمان گەردوون خۆی لە خۆیەوە نابێت، باشە ئەی ئەم هێزەی کە پێی دەوترێت سروشت چییە؟ ئەگەر هێزێك هەبێت دەسەڵاتی بەسەر گەردووندا هەبێت -وەکو دەیبینیی- ئەوا ئەم هێزە ناکرێت خودی گەردوون بێت. تەنها ڕێگە ئەوەیە کە توانستێك جیاواز لە ڕەگەزی گەردوون بوونەوەران بەڕێوەبەرێت، کە ئەوەش خوای بەتوانایە، بێگومان سروشتێکی کت و کوێر ناتوانێت ببێتە خاوەنی ئەم بوونە.

## کاتێ دەرگا داخراوەکان دەکرانەوە

چایەکان یەك لەدوای یەك دەهاتن، نزیکەی سێ سەعات بوو سەرقاڵی گفتوگۆ بووین. جاروبار سەرنجم لەو پیاوە دەدا، کە پرسیارەکان وەڵام دەدرانەوەو گرێ کوێرەکان دەکرانەوە وەك ئەوەی

لەژێر بارێکی قورس ڕزگاری بووبێت، برۆ گرژەکانی خاو دەبوونەوەو خەت و لۆچە قووڵەکانی ڕوخساری نەرم دەبوونەوە، تاوناتاوێکیش بزە دەکەوتە سەر لێوانی. سوپاسی خوام دەکرد کە دەمبینی ئەو شتانەی خوێندبوومانەوە کاریگەرییان هەبووە، بە هۆی ئەم گفتوگۆیەوە هەلم بۆ ڕەخسا بەرامبەرەکەم باشتر بناسم. ئەو شوێنانەی تێنەدەگەیشت دووبارە دەیپرسییەوەو هەندێك جاریش وەڵامەکانی پێ دووبارەو سێ بارە دەکردمەوە، توانای تێگەیشتنی یەکجار بەرز و بەهێزبوو. دوای ئەوەی نموونەکانمان خوێندەوە، ڕەخنە توندەکانی یەکەمجاری نەماو نەرم بوەوە.

ئینجا لە کۆتایی پەیامی سروشتدا وەڵامی ئەو پرسیارە هەیە کە خوای گەورە پێویستی بە پەرستشی ئێمە چیەو بۆچی لە چەندەها شوێنی قورئانی پیرۆزدا هەڕەشە لەوانە دەکات کە پەرستشەکان بەجێ ناهێنن. ئەوەشمان خوێندەوەو وەڵامەکەی هەر زۆر بە دڵ بوو، لە بەردەم خۆیەوە دەیوت:

- هەی دەم خۆش! کە وتت وەڵام دەبێ ئاوا بێت.

بیرم دێت کتێبەکەی لێ سەندم و لاپەڕەکانی هەڵدایەوەو ئەمدیو ئەودیوی پێ کرد:

- باوەڕکەن تێناگەم، ئەمە ڕاستییەکی زۆر بەرزە، دەمەوێت بۆ خۆمی بسەلمێنم کە لە خەودا نیم، دەڵێی هێزێکی نادیار دزەی کردوەتە ناخمەوە، بەربەرەکانێ و دژایەتی کردنی ئەم باسانەی لە

ناخمدا هەڵکێشاوە. ناتوانم ڕەخنەیەك چییە لێی بگرم. دەڵێی لەژێر ڕکێفی دەستێکی پەنهاندام. بەمانەی خوێندمانەوە نەك تەنها وەڵامی پرسیارێك بەڵکو وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی ترم دەست کەوت کە بە جۆرێك لە جۆرەکان نەمدەتوانی گوزارشتیان لێ بکەم. بەڕاستی هەموو ئەو بۆچوون و فەلسەفانەی دەربارەی هۆی دروستبوونی ئەم گەردوونە خراونەتە ڕوو، لێرەداو لەبەرامبەر ئەم ڕاستییانەدا دەکوژێنەوە، تا ئەم بابەتانە نەخوێندرێنەوەو هەرس نەکرێن هەڵکردنی بەیداخی فیکر و فەلسەفەلێدان هیچ مانایەکی نابێت.

دەرگایەکم بۆ کرایەوە کە ساڵانێکی زۆرە لەڕووم داخراو بوو، وابزانم لە زۆرێك لەو شتانە تێگەیشتم کە تا ئەمڕۆ نەمبینیوە یان نەمویستووە ببیینم یاخود لێیان شاردوومەتەوە، دەڵێی پەڕلەو تەلیسمێکیان داومەتێ تا تیماری گومانەکانمی پێ بکەم، ئەو شتانەی جاران لێیان دەترسام ئێستا چەند جوان و هاوڕێ دێنە پێش چاو.

بەڵێ، ئەو پیاوەی بە گفتوگۆ خۆشەکەی ناو پاسەکە کە دڵی هەمووماني بردەوە و دووچاری سەرسامی کردین، ئێستا دیار نەمابوو، میوانە ئازیزەکەمان چاوانی پڕ دەبوون لە ئەسرین و لێوەکانی دەلەرزین. ئەوەندەی نەبرد باس هاتە سەر باسی حەشرو زیندووبوونەوە، میوانەکەمان وتی:

- پێشتر زیندووبوونەوەی دوای مردن زۆر دوور بوو لە ژیریمەوە. بەس ئێستا دوای ئەم قسانە تروسکاییەکم بۆ دروست بووە، دەکرێت

زیاتر لەسەر ئەم باسە بوەستین؟ مەبەستم ئەوەیە کە ئاشکرایە مرۆڤ دوای مردن دەپووکێتەوەو دەبێتە خۆڵ یان هەندێك نەتەوە هەن کە مردووەکانیان دەسووتێنن و پاشان خۆڵەمێشەکەی دەدەن بەدەم باوە یان دەیکەنە دەریاوە، چۆن ئەمانە زیندوو دەبنەوە؟

تا ئێستا چیم پرسی بێت بۆ سەرخستن و لەسەر کردنەوەی بۆچوون و فەلسەفەیەك بووە، ئێستا بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا هەستدەکەم پێویستیم پێیەتی و دەمەوێت فێریم بۆیە دەپرسم.

بەمەبەستی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دیسان چووینەوە لای مامۆستای گەورە سەعیدی نوورسی و هانامان بۆ "پەیامی حەشر" برد، ئەم پەڕاوە پیرۆزە بە چەند نموونەیەکی بەرچاو باسەکانی زیندووبوونەوەو دانست و نهێنییەکانی لە زەین و ژیرییەکان نزیك دەکاتەوەو دەیسەلمێنێت.

"ئیتر چۆن دەتوانم بەرهەڵستی بکەم، ئەم کتێبە نەخشەی کۆڵانەکانی ئاخیرەتیشی کێشاوە!" ئەمە وتەی ئەو بێ باوەڕە بەناوبانگە بوو لەپاش خوێندنەوەی پەیامەکە.

پەیامی حەشر بابەتی زیندووبوونەوەی دوای مردن بە بەڵگەی چەسپێنەرو بەرچاو هەموو گومانەکان دەربارەی ڕۆژی زیندووبوونەوە دەڕەوێنێتەوەو لە بیست و نۆ شێوەی جیاوازدا دەیانخاتەڕوو، جگەلەوەش لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ڕادەی گرنگیی باوەڕ بە ڕۆژی

دوایی له ڕێکخستنی ژیانی تاك و كۆمەڵدا به چەند نموونەیەك ڕوون کراوەتەوە، پوختەی باسەکانی ئەو شەوەمان بریتی بوو له:

ـ ئایا دەگونجێت مرۆڤ بێ لێپرسینەوە بەرەڵا کرابێت و جڵەوی بۆ شل کرابێت تا وەك ئاژەڵان بژی؟

مرۆڤێك که میوەی درەختی بوونەوەرانەو لەسەر جوانترین شێوە بەدیهێنراوەو به جۆرێك دروست کراوە که له بەرزترین ئاستدا سوود له جوانی و بەخششەکانی گەردوون وەربگرێت. بووە به بینەرو تەماشاکەری ئەم گەردوونە سەرسوڕهێنەرە، ئەم دنیا گەورەیەش وەکو ماڵێك بۆی ڕازێنراوەتەوە، شاخەکان و دەریاکان خراونەتە ژێر فەرمانیەوەو هەواش بووەتە گوێرایەڵی، هەنگ هەنگوینی شیرین و شیفابەخشی بۆ دەکات و کرمێکی بچووك ئاوریشمی بۆ دروست دەکات بۆ ئەوەی سەرمای نەبێت و مانگا و مەڕەکان به شیرە خاوێنەکەیان بەخێوی دەکەن و درەختەکان لەکاتێکدا خۆیان قوڕ دەخۆن کەچی لق و پۆپەکانیان جۆرەها میوەی بەتامی پێشکەش دەکەن. مانگ کراوەتە چراکەی و خۆر بۆتە سۆباکەی و ئەستێرەکانیش له شێوەی فتیلەدان بۆی. مرۆڤیش بووەتە وەرگێڕی زمانی حاڵی ئەو بوونەوەرە لەژمارەبەدەرانەی که هەریەکەیان شایەتی لەسەر یەکتایی و گەورەیی خوا دەدەن و شەرەفمەندیی جێنشینیان پێ بڕدراوە.

- ئایا دەچێتە عەقڵەوە خوا مرۆڤی تەنها بۆ ژیانێکی شەست حەفتاساڵی بەدیهێنابێت و ئیتر وازی لێ بێنێت لە گۆڕدا ببێت بە خۆڵ؟ ئایا لە کردەوەکانی ناپرسێتەوە لەکاتێکدا کە هەموو گەردوونی بۆ ڕام کردووە؟ تۆ بڵێی پاداشتی ئەوانە نەداتەوە کە گوێڕایەڵی بوون و سزای ئەوانەش نەدات کە سەرپێچییان کردووە؟

لەسەر ئەم باباتە مامۆستا سەعیدی نوورسی دەفەرموێت: "مرۆڤ پەتی نەکراوەتە مل و بەرەڵا کرابێت تا بە ئارەزوو و ویستی خۆی بلەوەڕێت، بەڵکو هەموو کردارەکانی نمونەیان لەبەر دەگیرێتەوەو لەسەر هەموو ڕەفتارەکانی لێپێچینەوەو لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت".

- کێ ئێسك و پروسکە ڕزیوەکان زیندوو دەکاتەوە؟

پێویستە بگەڕێینەوە بۆ مێژوو لێرەدا:

دەگێڕنەوە کە ڕۆژێکیان ئوبەی کوڕی خەلەف ئێسکە ڕزیوێك دەگرێت بە دەستییەوەو دەچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا –دروودی خوای لەسەر بێت– ئێسکەکە وردوخاش دەکات و دەپرسێت:

- خوا ئەمە زیندوو دەکاتەوە، وا نیە؟

پێغەمبەری ئازیز: بەڵێ، خوای گەورە ژیان دەبەخشێتەوە پێی.

لەسەر ئەمە خوای مەزن ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە بۆ خۆشەویستەکەی: "کابرای خوانەناس ئێسقانێکی ڕزیوی بە نموونە بۆ هێناینەوە کە گوایە مردوو زیندوو ناکرێتەوە و دروستکردنی خۆیی

لەیادچوو کە چۆن لە دڵۆپێ ئاو دروستمان کردووە. وتی: کێ ئێسقانی ڕزیو زیندوو ئەکاتەوە؟ مەبەستی ئەوەبوو کەس ناتوانێ زیندووی بکاتەوە. تۆیش، ئەی موحەممەد، لە وەڵامیا بڵێ: ئەو کەسە زیندووی ئەکاتەوە کە یەکەمجار دروستی کردووە کە خوایەو ئاگای لە هەموو شتێکیش هەیەو، ئەزانێ مرۆ کە مرد چیی لێ ئەبێ، کە ڕزیی خۆڵەکەی ئەبێ بەچی‌و ئەکەوێتە کوێ‌و چۆن کۆئەکرێتەوەو ئەخرێتەوە پاڵ یەك و، بنیادەمەکەی جارانی لێ دروست ئەکرێتەوە.
یس: ٧٨-٧٩

ئەوەی جێی سەرنجە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەو کامڵی و ناوازەییەی یەکەمجارە وەختێ مرۆڤ دێتە دنیا. مادەم خوا مرۆڤی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، کەواتە بێ گومان هیچ کات زیندووکردنەوەیان لەلایەن ئەوەوە کارێکی دژوارو گران نابێت.

بەڵێ، ئەم زیندووبوونەوەی دووهەم جار کە ناوی حەشری لێ نراوە لەوانەیە زۆر لە دروستکردنەکەی یەکەم جار ئاسانتر بێت. مامۆستا نوورسی بە نموونەیەك ڕادەی ئاسایی ئەم زیندووکردنەوەیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. نموونەکە باس لە دووجار کۆبوونەوەی سوپایەك دەکات. سا ئەگەر ئەم سوپایە بۆ پشوودان بڵاوەی لێ بکەن، ئەوا تەنها بە دەنگی بووقێك زۆر بە ئاسانی دەتوانرێن لە شوێنێکدا کۆبکرێنەوە. سەربازەکان لە کۆبوونەوەی یەکەمجاریاندا یەکتری دەناسن و شوێن و فرمانی خۆیان فێردەبن، جا

ئەگەر بۆ جارێکی تر پەرش و بڵاوببنەوە ئەوا ئاسانتر کۆدەبنەوە وەك لە کۆکردنەوەکەی یەکەمجار.

سەربازەکانی ناو ئەم نموونە ناوازەیە ئاماژەن بۆ خانەکانی جەستەی ئێمە. کۆکردنەوەی خانە پەرش و بڵاوەکان لەدوای مردن بە فوو پێداکردنێکی ئیسرافیل بە بووقەکەیدا، هەرگیز لە کۆکردنەوەکەی یەکەمجاریان دژوارتر نابێت. بەدووrزانینی زیندووکردنەوەی جەستەکان لە ژێرییەوە لە تێنەگەیشتنی ئێمەوە سەرچاوە دەگرێت لە دروستکردنی یەکەمجارو بیرنەکردنەوەمان لێی، بەجۆرێك لەوانەیە ئەوەی یەکەمجار بە سادەو ئاسایی و بێ هونەر دابنێین، لەکاتێکدا زانستی پزیشکی سەردەم سەری سووڕماوە لە ژیانی کۆرپەلە لەناو منداڵدانی دایکداو زانست خۆیی و ناوبانگە درۆیینەکەی لە سەدەی بیستەمدا[1] دەستەوسانە لە دروستکردنی تەنانەت باڵە مێشێك کە بوونی خوا بە هەموو هێزێکییەوە دەسەلمێنێت.

---

١- مەبەست لەو تیۆریە بەناو زانستیانەیە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا بۆ چەواشەکردنی خەڵکی و وەك داردەستێك لەدژی چەمکە ئاینییەکان هاتنەکایەوەو سەرئەنجام لە تەرازوی ژێریداو لەئەنجامی پێشکەوتنی زانست و دەرکەوتنی ڕاستییەکان، ڕەواجی ئەو تیۆریانە ڕووی لە کزی کرد و زۆرێك لەلایەنگرانی ناچار بە دانپیانان کرد، لەوانەش تیۆریەکانی داروین سەبارەت بە بنەڕەتی ژیان.

دکتۆر هالووك نورباقی له کتێبێکیدا دەڵێت:

"ڕەنگه مرۆڤ پارێزگاری کردنی زیندەگی جەستەکان و پاشان گەڕاندنەوەی گیان بۆ ناویان به کارێکی دوور له ژیری بێته بەرچاوی لەکاتێکدا که هەموو سیفەته ماددی یەکانی مرۆڤ له تۆمارنامەی بچووکی (DNA) دەنووسرێتەوه که یەك لەسەر دە ملیاری سەری دەرزییەکی خڕە. ئەم ڕاستییه زانستییه ئەنجامی ئەزموونکاریی باوەڕپێکراوە، ئەگەر ئەم تۆماره گچکانه ئەو توانایەیان هەبووایه که له خاکدا گەشه بکەن، ئەوکاته دەگونجا تۆماری هەموو مرۆڤانی پێشین و ئێستاو داهاتووش له پەرداخێکدا کۆبکرانایەتەوەو بخرانایەته ژێر خاکەوە، ئەو دەمه گشت مرۆڤایەتی دەکرا زیندوو ببوایەتەوە. ئەو ڤایرۆسانەی که بۆ چەند سەدەیەك له ناو خاکدا دەمێننەوه بێ ئەوەی هەڵگری هیچ تایبەتمەندییەکی ژیان بن، هەر که هەلومەرجی گونجاویان بۆ هەڵکەوت، چالاك دەبن. بەڵێ، ئەی ئایا دەگونجێت ڕێگرێك هەبێت لەبەردەم خوای مەزندا تا ئەم مرۆڤه زیندوویکاتەوه لەحاڵێکدا هەموو بەڵگەکان گەواهی لەسەر گەورەیی و ڕەهایی ئەو دەدەن.

بەڵێ، ئەو خوایەی ئەم گەردوونەی بێ هەڵه دروستکردووە، هیچ ئاستەنگێك لەبەردەم توانای ڕەهای ئەودا نییه ئەگەر بیەوێت -که دەشیکات- هەموو تۆمارەکانی مرۆڤایەتی، که له پەرداخێکدا جێیان دەبێتەوە، بپەرشێنێت بەسەر ڕووی زەویدا و به فەرمانی "ببه!"

یەك زیندوویان بكاتەوەو لەسەر شانۆی بەسام و شكۆی حەشر كۆیان بكاتەوە." میوانەكەمان پرسیارێكی كرد سەبارەت بەوەی كە بۆچی ناتوانین كاروبارەكانی سەر بە جیهانی ئاخیرەت ببینین، هەر لە هەمان سەرچاوەوە وەڵامەكەمان هەڵگۆزی: "مەنزڵەكانی جیهانی بەرزەخ و ڕۆژی دوایی كە بە پەردەی پەنهان "غەیب" داپۆشراون بەم چاوانەی سەری ئێمە نابینرێن، بەڵكو دەبێت یا گەردوون بچووك بكەینەوە بۆ شارێك یان دەبێت چاوانی ئێمە گەورەبكرێن بەوێنەی ئەستێرەكان تا بتوانین ئەو شوێنانە ببینین و دەستنیشانیان بكەین."

پاش مەسەلەی زیندووبوونەوە باسەكانی چۆنێتی پاراستنی كۆمەڵگەو گەنجان هات بەناودا، دوای ئەوەی بۆچوونی میوانەكەمان وەرگرت، لە هەمان ئەو سەرچاوانەی پێشووەوە نەخۆشییەكانی كۆمەڵگە و چۆنێتی چارەسەر كردنیانمان خوێندەوە.

بەدەم خواردنەوەی چاكانمانەوە بابەتگەلێكی وەك: قەدەر، ڕۆح، فریشتەكان، چۆنێتی كێشانی گیانەكان لەلایەن عەزرائیلەوەو لە مردنە بەكۆمەڵەكاندا چۆن دەتوانێت لەیەك كاتدا لەچەندەها شوێن ئامادە بێت، حیكمەتی دروستبوونی شەڕو شەیتانەكان، ئایا دادگەری خوا چۆن ڕێگە دەدات هەندێك بە كەم ئەندامی لەدایك بن؟ هاتنە دنیای حەزرەتی عیسا بەبێ باوك، بۆچی وڵاتانی موسوڵمان نشین دواكەوتوون لەكاتێكدا قورئانی پیرۆز جەختێكی زۆر لەسەر زانست و

فێربــوون دەکاتــەوە؟ هۆکــاری ســەرهەڵدانی مەزهــەب و لایەنــە جیاوازەکـان، دیـدی ئیسـلام بـۆ کۆیلایـەتی، فرەژنـی، منداڵـەکانی حەزرەتی ئادەم کە دەکەنە خوشك و برای یەك چۆن هاوسـەرگیرییان لە نێواندا دروست بووەو بۆچی ئێستا دروست نییە؟ و چەندەها باسی تریش لە گفتوگۆیەکی برایانەدا بەڕێوەچوون، هەم ئەو و هەم ئێمـەش سـوودمان وەردەگـرت. جارێکیشـیان قسـە هاتـە سـەر ئـەوەی کـە مارکسییەکان بانگەشە بۆ یەکسانی دەکـەن و کەچـی هـیچ کـاتێکیش نەیانتوانیوە لە وڵاتانی خۆیاندا پیادەی بکـەن. "ئـەو پیـاوە" لایەنـە تیۆرییەکەی بـۆ بـاس کـردین، کـە داوای نموونـە بەرجەستەکەشـیمان کرد، وتی هێشتا ئەو وڵاتانە نەهاتوونەتە ئـەو ئاسـتە. لێمـان پرسـی: حەفتا ساڵە ڕژێمی کۆمیۆنیستی لە ڕوسیادا پەیڕەو دەکرێت، ئایا ئەم هەموو ساڵە بەس نییە بۆ فەراهەم هێنانی یەکسانی؟

دوای ئەوەی کەمێك بیری کردەوە: باشە ئەی ئیسـلام چـۆن ئـەم کێشەیەی چارەسەر کردووە؟ واتە چۆن چارەسەری ئـەو کەنـدەڵان و بۆشـاییە گەورەیـەی کـردووە کـە لـەنێوان هـەژاران و دەوڵەمەندانـدا هەیە؟ دیسان بە سوود وەرگرتن لە پەیامەکانی نوور:

-"بناغەی هەموو پشـێوی و شـۆڕش و ئاشـووبێك لـە کۆمـەڵگای مرۆڤایەتیـدا تـەنها یـەك ڕسـتەیە، هـەروەك سەرچـاوەی سـەرجەم ڕەوشتە نزمەکانیش تەنها یەك ڕستەی ترە..

ڕستەی یەکەم: گەر من بۆ خۆم تێریم چیم لە خەڵکی داوە؟ با لە برساندا بمرن!

ڕستەی دووەم: تۆ کاربکە با من بەری ڕەنجت بخۆم و، ماندوو ببە با من بحەوێمەوە!

بەڵێ، بە پارێزگاریکردنی هاوسەنگی نێوان چینی خەواص و عەوام، واتە "دەوڵەمەندان" و "هەژاران" نەبێت، هەرگیز ئاشتی و ژیانی ئاسوودەو تەبایی لە هیچ کۆمەڵێکدا نایەتەدی، بناغەی ئەم هاوسەنگییەش: سۆزو بەزەیی هاتنەوەی دەوڵەمەندانە بە چینی هەژاراندا و، گوێڕایەڵی و ڕێزنواندنی هەژارانیشە بۆ چینی دەوڵەمەندان.

وا ئێستا ڕستەی یەکەم چینی دەوڵەمەندانی بەرەو خراپکاری و ستەم داوەتە بەر و، ڕستەی دووەمیش چینی هەژارانی گرفتاری ڕق و قین و ئێرەیی و مشتومڕ کردووە. بەم جۆرەو هەر لەماوەی چەندین چەرخی پێشترەوە تا دەگاتە ئەم چەرخ و سەردەمەی خۆمان، حەوانەوەو ئاسایش لەگرۆی مرۆڤ سەندراوەتەوەو لێی بێ بەش کراوە، ئەوەبوو یەکەمجار، وەك لای هەمووان ئاشکرایە، ڕووداوە گەورەکانی مشتومڕی نێوان کرێکاران و سەرمایەداران لە ئەورووپادا سەری هەڵدا. خۆ شارستانێتی نوێش، بەهەموو کۆمەڵە خێرخوازی و دەزگا ڕەوشتیەکانی و گشت هۆکارە توندوتیژەکانی سەپاندنی یاسا، نەیتوانی ئەو دوو چینەی گرۆی مرۆڤ پێك بهێنێت و تەبایی و

ئاشتییان بخاتە نێوانەوە، هەروەك لە تیمار و سارێژکردنی دوو برینە قووڵەکەی ژیانی مرۆڤایەتیشدا دەستەوسان ما.

بەڵام قورئانی پیرۆز، بە "فەرزکردنی زەکات" ڕستەی یەکەم لەڕیشە دەردەهێنێت و برینەکەی سارێژ دەکات.. هەروەك بە"حەرامکردنی سوو" ڕستەی دووهەمیش لەبناغەدا هەڵدەتەکێنێت و شیفاو سارێژیش بە زامەکەی دەبەخشێت.

بەڵێ، ئایەتەکانی قورئان لەبەردەم دەرگای "جیهان"دا ڕاوەستاون و بە سوو دەڵێن: "هاتنە ژوورەوە قەدەغەیە!" هەروەها فەرمان بۆ گرۆی مرۆڤیش دەردەکەن کە: "دەرگاکانی سوو لە خۆتان دابخەن، با گشت دەرگاکانی جەنگ و ئاشووبتان لەبەردەمدا دابخرێت! هەروەك قورئان مەترسییەکانی چوونە ژوورەوە لەو دەرگایەوە بۆ قوتابییە ئیماندارەکانیش ڕوون دەکاتەوە، تاکو خۆیانی لێ بپارێزن"[١]

میوانەکەمان زۆر سەری لەم وەڵامە سووڕما. بەتایبەتی دەستەواژەی "یەکسانی ڕاستەقینە تەنها لەگەڵ باڵادەستبوونی یاسا دێتە بوون"ی هەر زۆر بە دڵ بوو. میوانەکەمان گەیشتبووە دوادوایی لیستی پرسیارەکانی کە لە بڵندگۆی مزگەوتەکانی ئەدەنەوە بانگی پیرۆزی بەیانی درا. کۆتایی هات بەو گفتوگۆیەی تا بەیان بە چاوی تەڕ و دڵی لەرزۆکەوە بەڕێمان کردبوو.

---

١- ئەم دەقە کوردییە لە وەرگێڕانەکەی، بەڕێز فاروق ڕەسوڵ یەحیاوە وەرگیراوە.

## یەکەم نوێژ و یەکەم دانپێدانان

کات چەند زوو تێپەڕی بوو! شەوق و تاسەمەندی ئەو دانیشتنەمان دە سەعاتی لەبەرچاو کردبووین بە دە خولەك، لەخۆشیدا خەریك بوو وەك چۆلەکە باڵمان دەگرت، ئەو شەوە کاتێکی مێژوویی بوو بۆ ئێمە. ئەو ڕووداوە نە هێرشی بۆمباو نە کوشتنی کەس و نە دەستڕێژی کردن بوو بەناو شوێنە گشتییەکانداو نە شتێکیش بوو دژ بە دەوڵەت و یاسا، بەڵکو ڕووداوەکانی ئەو شەوە هەرەس هێنانی لافاوی بێ باوەڕی بوو لەبەرامبەر ڕاستییەکانی ئیماندا. ئەمەش بە سوود وەرگرتن لە "پەیامەکانی نوور" کە ڕافەیەکی سەردەمانەی قورئانی پیرۆزەو نیشاندەری خۆری ڕۆشناو درەخشانی ڕاستییەکەیەتی. بەڵێ، ئەم بەرهەمە پرشنگدارانە دەستی ئەو پیاوەیان گرت کە نوێنەری سەنگەری بێ باوەڕیبوو و ژیانی ڕابردووی ئەویان ڕماندو وایان لێکرد دووبارە چاوبخشێنێتەوە بە دنیای ناو خۆیدا. زۆر بە ئاسانی دەکرا ئەم گۆڕان و دووبارە لەدایك بونەوەیە لە نیگاو ڕوانینەکانی ئەو پیاوەدا ببینرێن.

دوای ئەوەی هەموومان گوێمان بۆ بانگی پیرۆزی بەیانی گرت، خاوەن ماڵ بە میوانەکەمانی گوت:

- زۆر داوای لێبووردن دەکەین بەڕێزم، چاکمان ماندوو کردیت. لەژوورەوە جێیان بۆ ڕاخستوویت، فەرموون بچن پشوو بدەن، ئێمەش

نوێژەکەمان دەکەین و دەنووین، خۆم بۆ نانی بەیانی خەبەرتان دەکەمەوە.

میوانەکەمان دەتوت ئەم داوایەی هەر گوێ لێ نەبووە. لەگەڵ هاوڕێکەمدا خۆمان کۆکردەوە دەستنوێژ بگرین کە "ئەو پیاوە" هاتە لامەوە:

- بۆ تەمەنی مرۆڤ بەیانی زۆر دوورە مامۆستا، ئەبێ هەر ئێستا دەست پێ بکەم. ئەڵێم، منیش دەستنوێژ هەڵنەگرم؟

بەدوایدا دایە پرمەی گریان، لەوکاتەدا هەستم کرد هەموو گیانم دەلەرزێت، لەگەڵ ئەوەدا کە بە درێژایی ئەو شەوە قسەم کردبوو، کەچی لەو کاتەدا یەك وشەم بۆ نەهات و باوەڕم بە چاو و گوێیەکانم نەدەکرد، دەترسام هەموو ئەمانە خەونێك بن و کە بەئاگاهاتم بڕەونەوە، خوایە گیان تۆ چەند گەورەیت!

وەختێ دەمبرد بۆ لای دەستشۆرەکە بۆ دەستنوێژگرتن حاڵەت و خرۆشانێکی زۆر سەیر و تایبەتی هەموو بوونمی داگیرکردبوو، هەمووی چەند کاتژمێرێك لەمەوپێش بوو کە "ئەو پیاوە" بانگەشەی بۆ بێ دینی و بێ خودایی دەکردو نیو سەدەی تەمەنی لەپێناوی ئەم پەیامەیدا دانابوو، کەچی ئێستا دەستنوێژی دەگرت و دەکەوتە سەر چۆك لەبەرامبەر دەرگانەی میهرەبانی ئەو زاتەداو داوای لێخۆشبوونی دەکرد. بە هەڵسووکەوتیداو بەو گریانە بەکوڵەیدا کە وەك منداڵێك ژێر نەدەبووەوە دیاربوو بەزۆر خۆی بۆ دەگیرا. چەند تابلۆیەکی پڕ پەند

بوو خوایە گیان! دەتوت پەردەی تاقیکردنەوە لادراوەو ڕاستەقینە بێخەوشەکان دەرکەوتوون، وەرەو ئەم دیمەنە دڵت نەکات بە ئاو!

کە دەرلنگی پانتۆڵ و سەردەستی کراسەکەیی هەڵکردو سەیرێکی کردم تا بیبەم دەستنوێژ بگرێ، من وەك ئەوەی شتێکی ئاسایی بێت پشتم تێکرد، خۆم خەریك کرد بەچەند شتێکی ترەوە، ئەو میوانە ئازیزەمان لەگەڵ ئەوەدا کە نەیدەزانی دەستنوێژ چۆن هەڵدەگیرێت، لە ئامادەکارییەکدابوو کە لەوانەیە هەموو فریشتەکان ئێستا چەپڵەی بۆ لێ بدەن. هەستێك ئاگری لە ناخم بەردابوو نەمدەتوانی چاو لەو پیاوە بتروکێنم، بەلوعەکەی کردەوەو سەرەتا تۆزێ ئاوی کرد بەسەریدا، پاشان قۆڵەکانی هەتا شانی و قاچەکانی هەتا قولەپێی شت، ئەگەر ئەو کاتە ئاگادارم کردایەتەوە هەڵە دەبوو، خۆ هەرچۆنێك بێت کە دەستی کرد بە نوێژکردن خۆی فێری دەستنوێژ دەبوو. کە لەدوای خاوەنماڵەوە وەستاین بۆ نوێژ چاوم هەر لەسەر ئەو پیاوە بوو، دەتوت تواوەتەوەو لە هۆش خۆی چووە.

لەپڕ دەمی لە گوێم نزیك کردەوەو وتی:

- چ نوێژێك دەکەین؟

- نوێژی بەیانی.

- ئەی وایە، بەیانیان نوێژی بەیانی دەکرێت، چەند خەیاڵم ڕۆیشتووە، باشە ئەی چەند جار دادەنیشین و هەڵدەسینەوە؟

- دوو جار.

بەیەکەوە لەبەردەم خوای ئەزەل و ئەبەددا نوێژمان دابەست.ئاھ ئەو ساتە! ئاھ ئەو چرکەیە! خوایە گیان ئەو چێژو لەزەتە چی بوو؟ دەتوت لەھەمووی مادديات دابڕاوین و لە دنیای پڕ حەزو شەوقی مەعنەویاتدا پەرواز دەکەین، لەگەڵ ئەم میوانە ئازیزەدا منیش دەمویست ھاوارکەم: خوایە گیان چەند گەورەو بەشان و شکۆیت! دەسەڵات و توانای تۆ چەند مەزن و بەھەیبەتە! لەبەرامبەر ئەم لوتف و کەرەمە زۆرەی خوای گەورەدا زوبانم گیراوەو وشەیەکم بۆ نادۆزرێتەوە شایانی سوپاسکردنی ئەو بێت.دەبێت تۆ چەند مەزن بیت وا ئەو سەرە لەخۆباییانەی نیو سەدەیە دانەنەویون، ئێستا دێنە سوجدە بۆت. ئەو "من"انەی کەسیان بە ڕکابەری خۆیان نەدەزانی، ھانات بۆ دەھێنن و ئەوانەی تا دوێنێ دژایەتی شان و ناوو دینی تۆیان کردبووە بانگەشەی خۆیان، ھەنووکە لەبەردەم بچووکترین حەقیقەتدا چۆك دادەدەن و ناوت دەھێنن. خوایە تۆ چەند بەرز و پیرۆزیت!

دواتر ئەو پیاوە لە نامەیەکیدا کە بۆ منی ناردبوو ئاوا باسی ئەو یەکەمین نوێژەی خۆیی دەکرد: "یەکەم نوێژی ژیانم بوو، خوایە! چ حەزو شەوقێك بوو! بەدرێژایی نوێژەکە بێدەنگ دەگریام. پەیامەکانی نوور دەستی بردبوو بۆ دڵم و چی کوفرو پیسی ھەبوو ھەمووی فڕێدابوو، تەنھا ئەندێشەو ترسم ئەوەبوو چۆن ئەو شتانە بنیات بنێمەوە کە ڕووخاندوومن."

نوێژ تەواوبوو و هەستاینە سەرپێ، وتم خوا قبوولّی کات، ئەو قۆڵی لە ملم ئالاند و دایە پرمەی گریان. وەك منداڵێك هەنسکی دەدا، دیمەنێك بوو دڵی مرۆڤی دەکردە ئاو، دەیگوت:

ـ هەرچەندە بەندەیەکی سەرکەش و یاخی بووم کەچی تۆ بەخشش و خەزێنەی وات پێ داوم لەژمارە نایەن، تەنانەت نازانم چۆنی سوپاست بکەم، تا ئێرەت هێناوم ئیتر لەبەردەرگاکەت دەرم مەکە دەمەوێت پەشیمان ببمەوە.

ئێمەش نەماندەتوانی وەڵامێکی بدەینەوە، ئەوەی پێمان دەکرا گریان و فرمێسك ڕشتن بوو، کە قسەی دەکرد دەتوت ئاگای لە خۆی نیەو لەهۆش خۆی چووە:

ـ خوای من! چی دەبوو جارێکی تر بهاتمایەتەوە دنیا، ئێستا یەك خولەك ژیان بەم حەقیقەتانەوە ناگۆڕمەوە بە هەزار ساڵ ژیانی بێ ئاگایی، بەڵام هەیهوو! وەختێك تێگەیشتم کە قاچێکم لە گۆڕدایە، نازانم ئەم پاڕانەوەو نزاو گریانەم دەتوانێت شتێك بگۆڕێت یان نا، بەڵام سوێند بەخوا لەمەودوا هەموو ڕۆژێك گیانێك دەدەم لە پێناو چاککردنەوەی کاولکارییەکانم.

میوانەکەمان گریانە بەکوڵ و لالآنەوەکانی تەواوبوونیان بۆ نەبوو، کە ژیریش بۆوە چاوەکانی دەتوت دوو گۆمی خوێنن و قەفەسی سنگی وەکو کوورە نێڵەی دەهات، دوای نانی بەیانی هەرچۆنێك بوو تۆزێك هاتبۆوە سەر خۆی. تا ئەو کاتە بچووکترین زانیاریمان لەسەر

میوانەکەمان نەبوو، حەزمان دەکرد زیاتر بیناسین، کێ بوو؟ ناوی چی بوو؟ خەڵکی کوێ بوو؟ماڵیان لە کوێ بوو؟ ئێمەش زۆرمان حەزدەکرد گوێبیستی ژیانی پیاوێکی وەك ئەو بین، بەلام ئەو سەرەڕای ئەو هەموو تکایەی ئێمە سووربوو لەسەر ئەوەی زۆر خۆی نەناسێنێت و دەیگوت:

– وازم لێ بێنن بۆ خاتری خوا! دەتانەوێت گوێتان لە کوێی ژیانێك بێت کە پڕە لە ڕووخاندن و سەرپێچی و بێ باوەڕی؟ ژیانی من جگە لە ڕابردوویەکی تاریك هیچی تری تێدا نیە...

ڕابردوویەك کە ئەگەر بە وردی گوێی بۆ هەڵخەیت دەنگی هاوارو فەریادی ڕۆڵەکانی نەتەوە دەبیستڕێن. داروپەردووی خانەو لانە ڕووخاوەکان لەژێریدایە، لەکەی خوێنە ڕژاوەکان دەبینرێن، شوێنەواری پەلاماردان و پیلان گێڕان خۆیان دەردەخەن، دیسان ئەم ڕابردووە پڕە لەو پیلان و پرۆگرامە ڕووخێنەرانەی کە دارماندنی ئەم وڵاتەیان کردبووە ئامانج. دەتانەوێت ئەمانە ببیستن؟ ئێستا ئەو دەرگایەم بۆ مەکەنەوە. بەڵکو باسی ئەو پەیامە بەنرخانەو نووسەرەکەیانم بۆ بکەن کە بە یەك دوو سەعات ڕابردوویەکی پڕ لە تاریکی و ڕەشیی بۆ ڕووناك کردمەوە.باسی ئەم ڕووناکیەم بۆ بکەن کە مێشك و دڵەکانی لە شەوەزەنگ ڕزگارکردووە. چۆنێتی کارکردنی، مەبەست و ئامانجی، دەنگدانەوەی لە ناوەوەو دەرەوەی وڵاتدا،

بۆچوونی زانایانی تری ئیسلامیی دەربارەی، بەکورتی چی دەزانن بۆم باس کەن، ئێستا لەمە زیاتر نامەوێت گوێم لە هیچ شتێکی تر بێت.

بەکورتی ئەو شتانەمان بۆ ئەو پیاوە باسکرد کە مەراقی بوو و دەیویست شتیان لەبارەوە بزانێت، ئەو بە شەوقێکەوە گوێی بۆ گرتبووین و لە کۆتاییدا وتی:

- بەڵێ بەداخەوە ئەم خزمەتە پاکەی دەستی نەوەکان دەگرێت و ڕزگاریان دەکات، گەورەترین دوژمنی ئێمە بوو.

ئێمە زۆر سەرمان لەم دانپێدانانە سووڕما، پرسیم:

– بۆچی خزمەتی "پەیامەکانی نوور" و مامۆستا سەعیدی نوورسی گەورەترین دوژمنی ئێوە بوو؟ لەکاتێکدا زۆر ڕێکخراو و دامەزراوەی تر هەن کە بە ئاشکرا دژایەتی کۆمیۆنیزم دەکەن و لە سەنگەردان دژی؟ ئەمانە هەر فرسەتیان بۆ هەڵکەوێت دەڵێن ئێمە بەر لە کۆمیونیزم دەگرین، ئێمە نەبووینایە بەلشەڤیکییەکان دەمێک بوو ئەم وڵاتەیان داگیرکردبوو. هی وایان هەیە بە چەک دژتان دەوەستنەوە، بەڵام هەرگیز نوورسی و قوتابی و هاوکارەکانی پەنا بۆ ڕێگای ڕەق و زۆرکاری نابەن.

– پرسیارێکی زۆر گرنگتان لێ کردم، هەرچەندە وەڵامەکەی بە ڕوونی لە دڵمدا دەزانم بەڵام نازانم چۆنی بە ئێوەی بڵێم، نامەوێت ئەوە بڵێم کە هیچ زانیارییەکیشم نییە لەسەر خزمەتی پەیامەکانی نوور، بەڵام یەك جار ئەو بەرهەمانەم بخوێندایەتەوە دڵنیام ئێستا

دەمتوانی باشتر وەلامم بدانایەتەوە. کۆمیۆنیزم بیەوێت بچێتە وڵاتێکەوە کۆمەڵێك تەکنیك بەکاردەهێنێت، ئەمەش بریتییە لە خراپ بەکارهێنانی هەژاری و نەبوونی و هەوڵدان بۆ ناشیرینکردنی سیاسەتی ئابووری ئەو وڵاتەو پەیماندانی ژیانێکی باشتر بە خەڵکی ئەو ناوچەیە، ئینجا لەگەڵ ئەمەدا هەژارەکان وا پیشان دەدرێن کە دەڕووتێنرێنەوەو هەمیشەش دەوڵەمەندەکان لەمە بەرپرسیار دەکەن و بە دزیان دادەنێن، لاوانیش لە ڕێگەی بێ باوەڕی و ئارەزووەوە لەڕێ لادەدرێن. ئینجا لە کاردانەوەی ئەمانەدا کرێکارو قوتابی و هەژار دەهێنرێنە کۆڵان و سەرجادەکان، دەوڵەتی ئەو وڵاتە تەنگی پێ هەڵدەچنرێت و زەمینە بۆ گرژی وئاڵۆزی و پێکدادان خۆش دەبێت، ئەمەش ئامانجی هەموو ئەو کارانەی پێشووە.

ئەو گروپانەی بە هێز و چەك بەرەنگاری کۆمیونیزم دەبنەوە، لە ڕاستیدا نەك هەر ناتوانن بیوەستێنن بەڵکو بەو کوشتن و بڕین و پەلاماردانانە ئەوەندەی تر یارمەتی کۆمیونیزم دەدەن و جێی بۆ خۆش دەکەن. ئەمە خۆی لە خۆیدا ئەوەیە کە کۆمیونیزم دەیەوێت، چونکە ئەگەر تەنها کۆمیونیزم ئەم کوشتارە بکات ئەوا هەموو کۆمەڵگا و دەوڵەت و سوپا دەکاتە دوژمنی خۆی، بەڵام ئەگەر چەند گروپێك هەبن کە بانگەشەی بەگژاچوونەوەی کۆمیونیزم بکەن، ئەو کاتە دەوڵەت و کۆمەڵگاش دەبنە دوو بەشەوە، کۆمەڵێك لایەك دەگرن و کۆمەڵێکی تر لاکەی تر، ڕێك وەك ئێستا (واتە پێش ١٩٩٠)

کەس نازانێت کێ تاوانبارەو کێ بێ تاوانە، چونکە هەردوولا دەکوژن و ئاژاوە دەنێنەوە، یاسا ناتوانێت یەکێکیان بە خاوەن ماف و ئەوی تریان بە ماف خوراو دابنێت. لەبەرئەمە دەوڵەت دەبێ بەرەنگاری چەك بەدەستان بێتەوە سا ئیتر سەر بەهەر لایەنێك بن، هاوڵاتیش لەسەریێتی یارمەتی ئاسایشی وڵات بدات. ئەگینا ئەو گروپانەی گوایە دژی کۆمیونیزم وەستاونەتەوە هەمان مەرامی ئەو جێ بەجێ دەکەن و بەو ئاژاوە و پشێوییەش دەسەڵاتی دەوڵەتەکە لاواز دەبێت. ئەمەش ڕێك ئەوەیە کە کۆمیونیزم دەیەوێت.

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر پرسیارە سەرەکییەکە:

ماددەی سەرەکی کۆمیونیزم کە لاوانن لە ڕێگەی بێ دینی و ئارەزووبازی و بێ سەروبەری و پارەوە ڕادەکێشرێن بۆ لایی و وەك سپێرو قەڵغانێك بەکاردەهێنرێن. بەڵام مامۆستا نوورسی و قوتابییەکانی بێدەنگ کەوتوونەتە کۆشش بۆ یارمەتی دانی ئەم گەنجانە، چونکە هێزو چەك لەمەیداندا نیە زۆر نایەتە بەرچاو، بەم خزمەتە دەراسایە ژیری و دڵەکان ڕزگار دەکرێن، لەکەی گومان و بێ باوەڕی لە دڵیاندا دەسڕێتەوە، بیری ماددەگەرایی و سروشتگەرایی بە بەڵگەی زانستی و عەقڵی لەبن دەهێنرێن. لە ئەنجامدا ئەو لاوانەی هەڵگری ئەم بیروبۆچوونانەن یەکە یەکە دەخرێنە سەرڕێی ڕاست.

لەم گفتوگۆیانەوە بۆم دەرکەوت کە "پەیامەکانی نوور"ڕاڤەیەکی درەخشان و بێوێنەی قورئانی پیرۆزە. دەڵێی نوورسی ڕەحمەتی

هەموو پێداویستییەکانی ئەم چەرخەی زانیوەو گومان و دوودڵییەکانی نێو ژیری و دڵی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمەی بینیوەو بەگوێرەی ئەمە قورئانی پیرۆزی ڕاڤە کردووە. کەسێك خاوەنی ژیری و عەقڵ بێت و تۆزێکیش دڵسۆزی و ویژدانی تێدابێت نکۆڵی لە گەورەیی و گرنگی ئەم بەرهەمانە ناکات، لەبەرئەوە دەوڵەتێك نیازی ئەوەی هەبێت دژایەتی کۆمیونیزم بکات دەبێت هاوکاری ئەم خزمەتە بکات و بیخاتە پرۆگرامەکانی خوێندنەوە، چونکە هیچ چارەیەکی تر نییە لاوان لە ئارەزووبازی سنووربەزێن و کات بەفیڕۆدان و بێ بەرنامەیی و خۆدزینەوە لە ئەرکی سەرشان، بگێڕێتەوە دواوە. پرسیم:

- باشە سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵانەی داویەتی، بۆچی کۆمیونیزم لەم وڵاتەدا نەیتوانیوە سەرکەوێت؟

پێکەنی:

- بۆچی کۆمیونیزم نەیتوانیوە بێتە ئەم وڵاتەوە لە کاتێکدا زەمینەیەکی زۆر گونجاو هەیە بۆ گەورەبوون و گەشەکردنی؟ وابزانم جوانترین وەڵامی ئەم پرسیارە منم، وا نیە؟

پەنجا ساڵی ڕەبەقی زیندەگیم بۆ ئەم بانگەشەیە تەرخان کرد، چەندەها جار ژیانم کەوتە مەترسییەوە بەهۆیەوە، گەر ئەو ئازار و چەرمەسەرییانەی بینیومن لەم ڕێیەدا هەستم بە نووسینەوەیان، کتێبخانەیەك پڕ دەکاتەوە، کەچی دوای گفتوگۆیەکی چەند سەعاتی، هەموو دنیام، بۆچوونم، باوەڕم، فەلسەفەم ئاوەژوو دەبێتەوە، تەوبە

دەکـــەم و دەچـــمە ســـوجدە. بـــەڕای مـــن شـــتێکی تـــری لەمـــە سەرسـووڕهێنەرترت لـەم سـەدەیەدا دەسـت ناکەوێت.پێویسـتە ئـەم ڕاستییە نەك هەر بە وڵاتی خۆمان بەڵکو بە هەموو دنیا ڕابگەیـەنرێت، هەرگیز کۆمیونیزم ناتوانێت بەسەر بەربەستێکی وا پتەودا بازبدات.

بە من دەڵێن سـاڵح گـۆك کایـا، واتــە نازنـاوەو لـەناو دۆسـتان و دەورووبەرەکەمدا بەمە دەناسـرێم. کـە پرسـیمان ئـەی نـاوی ئەسـڵێت چییە، دیسان زەردەخەنەیەکی نواند:

- ئێستا ئەمەندە بزانن بەسە، ئیتر لەمەولا دۆست، بـەڵکو بـراین، لە ئایندەدا زۆرتر یەکتر دەبینین و قسە دەکەین. ئەو کاتە بچووکترین شتی لاوەکیش لەبارەی منەوە دەزانن، بەڵام ئێسـتا دەبێـت بمبـوورن کە وەکو نهێنی هەندێکیتان لێ دەشارمەوە.

کاك ساڵح یەکێك بوو لە پێشەنگەکانی بـواری خـۆی بۆیـە دەبـوو پارێز بکات لە بڵاوکردنەوەی گەڕانەوەکەی، بەتایبـەتی بـۆ پاراسـتنی گیانی خۆی. ئێمەش لەمەدا حەقمان پێ داو باسەکەمان گۆڕی.

پرسیم:

- لە ئێستادا (واتە ساڵی ١٩٧٩) هێزی ڕاستەقینەی مارکسییەکان لەم وڵاتەدا چین؟

- لە سەدا حەفتایان ئەوانەن کە حەزی ناوبانگ دەرکردن داوێتـی لە کەللەیان، لە سەدا بیستیان بۆ پلەوپایـەو پـارە، لـە سـەدا پێنجـی دەیـەوێت لــە ڕێگــەی کۆمیونیزمــەوە بگــات بــە ئامــانج و ئاواتــە

کەسییەکانی، واتە ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها لە سەدا پێنجن کە خەون دەبینن بەو دنیا نموونەییەوە کە لە ئاوەزی خۆیاندا سازیانداوەو کۆمیونیزم مژدەی هاتنی دەدات، ئەمانە بێ چاوەڕێ کردنی بەرامبەرێك فیداکارانە هەوڵ و کۆشش دەدەن.

وەکو دەبینرێت هێزی ڕاستەقینەی کۆمیونیزم لە وڵاتی ئێمەدا تەنها لە سەدا پێنجە و مەردی بانگخواز کە بەڕاستی مەبەستی گەیاندنی پەیامەکەی بێت هەر زۆر زۆر کەمە.

ئەو پرسیارەم کرد کە هەر لە سەرەتای گفتوگۆکەمانەوە خولیای سەرم بوو:

- ئەی شوێن و کاری ئێوە چی بوو لەم پەیامەدا؟

دیسان بزە گرتی:

- دووبارە ژیانی تایبەتیم؟ باشە، هەوڵ دەدەم بەکورتی بۆتانی باس بکەم:

- هەموو شتێکم بۆ ئەم پەیامە تەرخان کردبوو، وامدەزانی ئەمە تەنها ڕێیە بۆ چاککردنی هەموو ئەو هەژاری و ناشیرینییانەی دەیبینم و لەمەوە دەگەمە ئەو ژیانەی لە خەیاڵمدا وێنام کردبوو، ئەم فەلسەفەیە لە کەسێتی و ڕۆحمدا ڕەگی داکوتابوو. بەنرخترین ساڵانی تەمەنم لەڕێیدا خەرج کرد، چی هەبوو دەربارەی کۆمیونیزم هەموویم لەبەربوو. باش پڕیان کردبووم، باش پڕ بووبووم. ئەم پەیامە

پارچەیەك نەبوو لە ژیانم بەڵكو بووبووە خودی ژیان لام، زوو ناوم دەركردو هەر بە گەنجی پلەوپایەی گرنگم بەدەست هێنا.

ئینگلیزی و فەرەنسی و ڕووسی و نیمچە عەرەبییەكیش فێربووبووم بەشكم بتوانم خزمەتێكی زیاتر بكەم، چەندەها جار لەسەر ئەم پەیامە لە كاری كەسیی خۆم دەركراوم. چەندەها شەوم، كە ئێستا ژمارەیانم لەبیر نەماوە، تا بەیان لە زیندانەكاندا بە شەق خواردن بردۆتە سەر، بەڵام هەرگیز چاوەڕێی كرێ و بەرامبەر نەبووم، كەچی ئەوانەی لەگەڵ مندا كەوتنەڕێ گەیشتنە پلەگەلێكی زۆر بەرزتر لە من، ناویانگیان دەركرد، زۆربەیان لەم ڕێیەوە خەڵك بووە ئاشنایان، زۆربەیان لە ژێر ئەم پەردەیەدا بوون بە ملیاردێر، من بیرم لە هیچ كام لەمانە نەدەكردەوە، وا دەزانن نەیان داومەتێ؟ نەخێر. باوەڕبكەن بمویستایە هەموو ئەوانە ئێستا لە مشتمدا دەبوون، بەڵام ئەو دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و حەز و شەوقی خزمەتەی ناو دڵم هەرگیز ڕێگەی پێ نەدەدام. خۆتان دەزانن كەس نایەوێت لە ڕیزەكانی دواوە بێت، چوونە پێشەوە زۆر خۆشترە، كەچی من هەمیشە خەریكی بەڕێوەبردن و ئۆرگانیزەكردنی ڕیزەكانی دواوە بووم و وا بیرم دەكردەوە كە ئەم كارە بێ من ناتوانێت پێشكەوێت.

زۆر مەراقم بوو لە نزیكەوە سەركردە ماركسییەكانی جیهان بناسم، هەر بۆیە بۆم هەڵكەوت بە دیداری خواجە ئەنوەر، مارشاڵ تیتۆ، میلافۆن دیژیلاس، فیدڵ كاسترۆ، جەمال عبدالناصر و زۆرێك لە

پێشـەنگە ڕووسـی و چـینییەکان بگـەم. ژیـانی ئـەوان تووشـی خەیاڵشـکاوی کـردم، لەوانەیـە هـەژانی بۆچـوونی مـن سـەبارەت بـە کۆمیـونیزم و درز کەوتنـە دنیـای فکرمـەوە لـەو ڕۆژانـەوە سـەری هەڵدابێت. هەستمدەکرد کۆمیـونیزم ناتوانێـت ئـەو ژیـان و کۆمەڵگـە نموونەییە دروست کات کە خەونی پێوە دەبینین. باسکردنی ئەمە بە دەنگی بەرز شتێك بوو ئازایەتی و بوێری دەویست، دەبوو هەرچۆنێك بێت لەم ئەوینـە ناتـەواو و لارە دەربـازم بێـت، ئـەم یەکترناسینەمان پـەرداخی پرسـیارە بـێ وەڵام و گومانـەکانمی پڕکـردو لێـی ڕژا، بـە واتایەکی تر ئـەو درزەی سـاڵانێکی دوور و درێـژ بـوو کـەوتبووە بـیرو بۆچوونەکانمەوە، ئەمڕۆ خاڵی شکان و لەیەك جیابوونەوەی بوو. ئەمە دەرەنجامی شەوێك، ڕۆژێـك، سـاڵێك نیـە، بـەڵام ئەمشـەو بـۆ مـن زۆر گرنگە چونکە بڕیاری یەکلاکەرەوە تیایدا لەدایك بوو، چونکە ئەمشـەو زەمینەیەکی وای ڕەخساند کە هەم بۆچوونەکانم و هەم ئامانجی ژیـانم بخەمە ژێر پرسیارو پێداچوونەوەو بڕیارێکی بوێرانە بدەم.

ئێستا پێویستیم بەوەیە هەموو ئەمانە لەسەرخۆ و بـەوردی و بـە مێشکێکی هێمن هەڵبسەنگێنم. کۆتا پرسیارم لە کاك ساڵح کرد:

- ئێوە خواری و نادروستییەکانی کۆمیونیزمتان بە چاوی خۆتـان دیوە، ئەی کەوایە بۆچی پەنجا ساڵی ڕەبەق پشتگیریتان لێ کرد؟

- مرۆڤ کە باوەڕی بە شتێك کرد هەروا بە ئاسانی لارووێرییـەکانی نابینێت، نەماندەتوانی ئەو هەموو ئـەرك و مانـدووبوون و زەحمەتـەی

ئەو هەموو ساڵە لە چرکەیەکدا بخەینە لاوە، هەمیشە باوەشمان دەکرد بەو هیوایەدا کە ڕۆژێك دێت ئەو ناشرینییانەی دەیبینین دەبنەوە بە چاکی و جوانی، کە هەڵەیەك دەکرا دەمان وت: " ئەمە خەتای ئەو دەوڵەمەندو ئەرستۆکراتانەیە کە هەڵخەڵەتێنراون." و بەم جۆرە خۆمان لێی گێل دەکرد.

لە لایەکی ترەوە لە پێناو داگیرکردنی دنیادا ئەو سووکە زیانانەم زۆر بە ئاسایی دەهاتە پێش چاو، لە پێناو ئەمەدا سانا بوو بە لامانەوە هەندێك کەس و هەندێك دەوڵەت ببنە قوربانی، چەند ڕاستییەکی تاڵە! چاومان لە کوژرانی براکان دەقوجاند بۆ دروستکردنی "برایەتی جیهانی"!

هەموو ئەمانە سالانێکی دوور و درێژە شەپۆلێکی نهێنی دووفاقییەتیان لە مندا دروستکردووە کە هەرگیز نەمدەتوانی بەری لێ بگرم و کپی بکەم. دڵم وای لێ هاتبوو سەرپێچی گوفتارەکانی زوبانمی دەکرد. بە کوشتدانی بێ بەزەییانەی خەڵکی لە پێناو خەونێکدا، خەیاڵەکانمی شێواند بوو، جگە لەوەش پرسیارەکان سەبارەت بە مرۆڤ و ژیان و بەندایەتی، سەنگەرێکی جودایان پێك هێنابوو. هەموو ئەمانە منیان گەیاندبووە دووڕیانێك بەڵام هەرچەندم دەکرد نەمدەتوانی خۆم یەکلایی کەمەوەو هەنگاو هەڵنێم، ئەم بەیەك گەیشتنەمان نیازی چەند ساڵەمی هێنایەدی و ناساندمی بە جیهانێکی نوێ. باوەڕێکی زۆرم هەیە بەوەی کۆمیونیزم بەم پیادەکردنە دوور لە

ژیرییانـەی، کـوژرانی خـۆی نـزیکتر دەکاتـەوە، وای لێ هـاتووە بۆتـە جانــەوەرێکی خودکــوژی خۆخــۆر، لــە دنیایەکــدا کــە زانســت و تەکنـەلۆجیا پێشـکەوتووە، کۆمیـونیزم لەمـە زیـاتر ناتوانێـت خـۆی بگرێت، بە ڕای من تەمەنی کورتە.

ڕۆژگار دەری خست ئـەم پێشـبینییەی کـاك سـاڵح کـە لـە سـاڵی ١٩٧٩دا کردبـووی چـەند وتەیـەکی ڕاسـتەو لـە جێـی خۆیدایـەتی. لـەکۆتایی سـاڵی ١٩٩٠دا ڕژێمـە کۆمیونیسـتییەکان یـەك لـەدوای یـەك بەدەسـتی هاوڵاتیـانی خۆیـان ڕووخێنـران، پارتـە کۆمیونیسـتەکان داخران و خەڵکی ئازادانە ڕوویان کـردە سـندووقەکانی دەنگـدان. ئـەو ڕژێمەی ئـەم سـەدەیەی خوێنـاوی کردبـوو چـووە مێـژووەوە. هێشـتا ئـازارو فـەریادی قوربانیـانی دەسـتی ئـەم سیسـتەمە خوێناوییـە دڵان دەهێننە سۆ. زۆر شتی تر مابوو باسی بکەین بـەڵام وادەی هەسـتانی پاسـەکەمان نزیـك بووبـۆوە. لـەنێوان هەڵچـون و سـۆزو فرمێسـکێکی زۆردا ماڵئاواییمان لەیـەك کـرد. ئەدرێسـی پۆسـتەی خۆمانمـان پێـداو پێمان وت کە چاوەڕوانی نامەکانی دەکەین، بـەڵام نەمانـدەزانی ئەمـە یەکەمین و دوایەمین جارمان دەبێت ئەم میوانە ئازیزە ببینین.

ئەم دۆستە بەڕێزەی تەنانەت ناوی ڕاستەقینەشـیمان نـەدەزانی، گەورەترین وانەی لـە ژیانمانـدا پـێ وتینـەوە، لەڕاسـتیدا ئێمـەش زۆر شت لەوەوە فێربووین.

## نامەکان:

ڕێك حەوت مانگ دوای ڕووداوەکە نامەیەکم بەدەست گەیشت، زیاتر لە چەند تێبینی یەك دەچوو وەك لە نامە:

"لە ئێستادا پەیامەکانی نوور دەخوێنمەوە، دەیخوێنمەوەو قووڵ تێ دەفکرم و لە جیهانە بێ سنوورەکەیدا ون دەبم، وەکو شیفایەك بەهانام دەگات و تۆفانەکانی ناو ڕۆحم هێمن دەکاتەوە."

نامەکە لە کاك ساڵحەوە بوو، لەنامەکەیدا ناونیشانێکی پۆستەی پێ دابووم. خێرا تاوم دایە قەڵەم و کاغەزو چی لەدڵمابوو نووسیم، هەموو حەسرەت و شەوق و تاسەمەندیم هەڵڕشت.

چەند مانگێکی تریش تێپەڕین، کەچی هێشتا وەڵامی نامەکەمم پێ نەگەیشتبوو، بەڵام من بێ گوێ دانە ئەمە یەك لەسەر یەك نامەم دەنارد، بەداخەوە نامەکان وەکو خۆیان بەدەستم دەگەیشتنەوە.

سێ ساڵ دوای بەسەرهاتەکەو لەکاتێکدا کە تەواو هیوابڕاو بووبووم، نامەیەکیم بۆ هات، ئەو ڕۆژە وامدەزانی جەژنە.

نامەکە دەستی دەخستە سەر برین و نەخۆشییەکانی سەردەم و ڕێگاچارەکانیانی دیاری دەکرد. ئەم نامە دوورو درێژو پڕ لەپەندەم چەندەها جار خوێندەوەو گشت جارەکانیش نەمدەتوانی بەر لە فرمێسکەکانم بگرم.

خێرا نامەکەم بڵاوکردەوە بە دەوروبەری خۆمدا.حەزمدەکرد ئەو خۆشی و شادییە برایانی تریش وەکو من بیچێژن. ببێتە مژدە و

گورێکی تازە بۆ موسوڵمانان. ئەم نامەیەی مزگێنی ئەو بەهارە دەدات کە پەیامەکانی نوور لە دڵەکاندا دەینەخشێنن، بووە مایەی خۆشی و بەرەکەت بۆ ئێمە و هەستەکانمانی هەستاندبووە سەرپێ.

## ئەمەش نامەکەیە:

"برای زۆر بەڕێز و بەنرخم...

بەهۆی ئەم نەخۆشی ئیفلیجییەوە کە دوو ساڵ لەمەوبەر تووشی بووم، ناچاربووم وەڵامی نامەکانت دوابخەم، لەنامەکەتدا دەپرسیت کە چۆن شەرەفمەندی ڕاستییەکانی ئیمان بووم و حەزەکەیت بزانیت دەربارەی ژیانی ڕابردووم. واهەستەکەم مادەم خۆت ئاگاداریت چۆن پەیامەکانی نوورم ناسیوە ئیتر پێویست بە ڕوونکردنەوەی زیاتر نەکات، بەڵام بۆئەوەی دەری بخەم کە ئەم پەیامانەی ڕاستییەکانی قورئان دەدەن بەگوێی ئەم سەردەمەدا و چ گۆڕانێك دروست دەکەن لە دڵە سەرکەش و یاخییەکاندا و چۆن هەموو ئەو ڕێباز و سیستەمانە پارچە پارچە دەکات کە وەکو ڕێگاچارە خراونەتە بەردەستی مرۆڤی ئەم سەدەیە. بەڵێ، بۆ دەرخستن و سەلماندنی هەموو ئەمانە، پێویستە سەرلەبەری ژیانم بە هەموو جوانی و ناشیرینیەکانییەوە بگێڕمەوە، بە چاوی پەند لێوەرگرتن بۆی بڕوانە:

باوکم لادێییەکی هەژار بوو کە هەموو نەهامەتی و نەبوونییەکانی جەنگی جیهانیی یەکەمی بەچاوی خۆی بینی، هەرگیز بەوەی دەستی

دەکەوت نەیتوانی زگی خۆی تێربکات و ڕووی نەبوو بچێتە ناو خەڵك و هاوارکات و بڵێ "منیش وەك ئێوە مرۆڤم". لەو قات و قڕییەدا سەرەتا دایکم و دواتر چوار براو خوشکی لەخۆم گەورەترم مردن، باوکیشم لەترسی ئەوەی نەوەك من برسی بم، ڕۆژێکی زستان چوو بۆ ڕاوەماسی و چیتر نەهاتەوەو ئاو بردی بێ ئەوەی ببێت بە خاوەنی کفنێکیش، ئەوکاتە پێنجساڵان بووم و لەم دنیایەدا بەتاقی تەنها مامەوە. کەسێکم نەبوو پێم بڵێ "ڕۆڵە گیان" و بمنێ بە سنگییەوەو ئەسرینم بسڕێت و نازی بەسەردا بکەم.

لە هەل و مەرجێکی ئاوا دژوارو نالەباردا کەوتمە کۆڵان و سەرجادەکان، بە سەدەقەی خەڵکی زگم تێر دەکردو زۆر شەوانیش بە برسێتی ڕۆژم دەکردەوە، ژێری پێم نەك هەر دڕك بەڵکو بزماریش نەیدەبڕی. ئەم ئازارە قووڵە جۆرێك لە سەرسەرێتی و یاخیبوون و سەرکەشی لەمندا چێکردبوو. لە دە ساڵیدا هەستەکانی لەجۆری بەزەیی و ویژدان و ئەو شتانە لە بوونما نەمابوو، بەم هەستە پیسانەوە چوومە قوتابخانە،قوتابی و مامۆستاکانی چواردەورم نموونەی پەستی و نزمی بوون، لە دەرفەتێك دەگەڕان بە کۆمیونیزم تەڵقینمان دادەن. هەموو دڵم دایە دەستی ئەم مرۆڤانەی کە ڕێك بەزمانی دەردەکەی من دەدوان، مامۆستاکانمان دەیانویست بە هیچ شتێك باوەڕنەکەین کە بە چاو نابینرێت و بەدەست ناگیرێت و گوێمان لەدەنگی نابێت. بەم شێوەیە پایە سەرەکییەکانی ئیمان یەك لەدوای

یەك سڕێنرانەوە لە مێشكماندا، بەجۆرێك وای لێ هاتبوو هەموومان گاڵتەمان بە خواو فریشتەكان و قەدەر دەكرد.

چونكە من قوتابییەكی زیرەك و لێهاتووبووم زیاتر كارم لەسەر كرابوو و وەكو نموونەیەكی بەرجەستەی بێباوەڕی و كۆمیونیزم نیشانی ئەوانی تر دەدرام، بەشێوەیەك فەلسەفەی ماركسیزم و هەموو مێژووەكەیم پیت بە پیت لەبەركردبوو، بۆیە هەمووكەس پێیان دەوتم "لینین". لەم ڕێیەدا خێرا بەرەوپێش چووم و بەرسیارێتی قوتابخانە و گەڕەك و پاشان ناوچەم وەرگرت، ئیتر هەموو ڕێگەكان لەبەردەممدا ئاوەڵا بوون و گەیشتمە قۆناغی پلان دانان و بەڕێوەبردنی كارەكان. بوومە بەرپرسێكی گرنگی ئاسایش، تا ئەو ڕۆژەی خانەنشین كرام بێ ماندووبوون و تاقەت چوون، خزمەتی پەیامەكەمم دەكرد.

ملیۆنەها سەرچاوەی یارمەتیم كۆكردبۆوە بەمەبەستی سەرخستنی بانگەشەكەم، لەڕێگەی ئەو پێگەو دەسەڵاتەی كە هەمبوو دەمتوانی دەستم بگاتە گشت سەركردە جیهانییەكانی كۆمیونیزم و لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو دانیشم، لەژێر ناوی پاراستنی دەوڵەتدا بە چوار چاو چاوەڕێی هاتنی ئەو ڕۆژە بووین كە دەوڵەت تێیدا دەڕووخێت. هەزارەها لاومان لە بڕواداری كرد، لە كۆتاییشدا كە گیراین بە سزایەكی سووك لێی دەرباز بووین. ئەمەمان بە شەرەف زانی و هەستەكانمان نەكوژانەوەو بەپێچەوانەوە ئیشتیهامان زیاتر بزوا. هەموو گەردیلەكانی جەستەمان و هێزو توانامان بووبووە

فەرمانبەرداری کۆمیونیزم. تەنانەت خەویشمان لەبیر چووبۆوە.
کەچی بڕواننە قەدەر! ئەو ڕاستیانەی کە من سەراپای ژیانم لە جیهانی کۆمیونیزمدا بەدوایدا وێڵ بووم، لە تەنها گەشتێکدا بۆم ڕوون بوونەوە.

لە یەکێك لە مانگەکانی پایزی ساڵی ( ١٩٧٩ ) لە قەیسەری سواری پاس بووم تا بچمە ئەدەنە، کاکی شۆفێر وتی "کێ دەیەوێت گۆرانی و بەستە بچڕێت با بفەرموێتە لای میکرۆفۆنەکە، ڕێمان دوورەو وا نەبێت تەواو نابێت، هەم کاتەکەمان لێ دەڕوات و هەم سەرگەرممان دەکات". من ئەمەم بە فرسەت زانی و هەستامە سەرپێ، دەنگە خۆشەکەم و گۆرانییەکانم سەرنشینەکانی مەست کرد، کە زانیم زەمینەیەکی لەبارم پێك هێناوەو چیتر گومانم لێ ناکەن، کەوتمە قسەکردن. وتم هاوڕێیان کەس هەیە لە ناوتاندا بەختەوەر و شادمان بێت؟ ئەم پرسیارە وەك گوللە دابارییە سەریان و وشك بوون و تووشی سەرسامیی کردن. بەردەوام بووم:

کەستان تیا هەیە بڵێت گشت پێداویستییەکانی ژیانم دابین کردووەو چیتر پێویستیم بە هیچ شتێکی تر نیە؟

ئنجا دام لەبنی کوولەکەکە: " نەخێر هاوڕێیانم ئەمانە هەڵبەتە کە ئەستەمن، چونکە ئێوە مەحروومن لە ڕژێمێك کە ئەمانەتان بۆ دابین بکات و وەڵامی ئەم پرسیارانەتان بۆ بکات بە ئەرێ".

بـە زمانێـك كـە سەرنشـینەكانی پاسـەكە لـێم تێبگـەن و بـە وریاییـەوە نـەوەك پـێ بنـێم بـە هەسـتێك یـان بـیر و باوەڕێكیانـداو تووڕەیان بكەم، كەوتمە باسكردن و پڕوپاگەندەكردن بـۆ پەیامەكـەم، دوو سەعاتی ڕێك وتارم بۆ دان. هەموو حـەیران مـابوون. گـەنجێك لـە ناو گەشتیارەكاندا دیاربوو ئـەم شـتانەی بـەدڵ نیـەو ئاگـام لێبـوو لـە هـەڵێك دەگـەڕا. لـەنێو چـیا مەزنـەكانی تۆڕۆسـدا كـە پاسـەكەمان تایەكەی تەقی، گەنجەكە فرسەتی هێناو گرتمی، زۆر خاكییانـەو دوور لە هەموو لووت بەرزییەك پیرۆزبایی لێكردم. وتی مامۆستای بەڕێز بـە قسەكانتان ئێمەتان زیندوو كردەوە، زۆر بە باشـی خۆتـان پـەروەردە كردووە، زۆر بابەت هەیە كە هیوادارم جـەنابتان بـۆم ڕوون بكەنـەوەو سوودم پێ بگەیەنن، بۆ نموونە مرۆڤ چییە؟ ئەم پرسـیارەی كـە هـیچ وەخـت چـاوەڕێی نـەبووم بـەر شـەوارەی خسـتم، لـە كاتێكـدا ژیـانی سـەركردە ماركسـییەكان و نـاوەڕۆكی هـەموو دانراوەكانیـان و وردودرشـتی مێـژووی وڵاتـە كۆمیونیسـتییەكانم دەزانـی، كەچـی هـیچ كات شتی وا نەهاتبوو بە مێشكمدا. ناسینی خـۆمم لەبیرچـووبوو، كـە من هەمان پرسیارم ئاڕاستەی ئەو كرد وتـی ئەمـە بابـەتێك نییـە ئـاوا سـادەو سـەرپێیانە بـاس بكرێـت، كتێبێكـی بچـووك لـە گیرفانمدایـە، ئەگەر بەلاتانەوە ئاساییە بەیەكەوە شتێكی لێ دەخوێنینەوە.

چووینە گۆشەیەكی تەنهاوە، بەهـەموو توانـای دەیویسـت بـوونی خوام بۆ بسەلمێنێت. لەبەرامبـەر هەنـدێك لـە پرسـیارەكانمدا وەڵامـی

زۆر جوانی دامەوە. تێگەیشتم ئەم گەنجە کەسێکی ئاسایی نیە. لە کۆتاییدا دوای ئەم هەموو ساڵە یەکێکم دۆزییەوە لەئاستی خۆمدا بێت، بەجۆرێك فەلسەفەی کۆمیونیزمی بەقەدەر من باش دەزانی، گفتوگۆکەمان تا گەراجی ئەدەنە بەردەوام بوو. حەیران مابووم، هێشتا گەشتی هاورێ لاوەکەم تەواو نەبووبوو. قۆڵیم گرت و وتم نایەڵم بۆ هیچ شوێنێك برۆیت، دەبێت بگەینە ئەنجامێك، مێشکم تێکەڵ و پێکەڵ بووە، پرسیاری زۆری ترم ماوە، هەرچۆنێك بووە دەبێت ئەمرۆ لێرە بمێنیتەوە. گەنجەکە وتی بە مەرجێك دەمێنمەوە ببیتە میوانی من، رێکەوتین، بەیەکەوە چووین بۆ ماڵی هاورێیەکی ئەو، مامۆستا لاوەکە بە کتێبەکانی بەردەستی یەك بە یەك وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دامەوە، ئەو گرێکوێرەو گومانانەی ساڵانێك بوو خۆیان لەناخمدا مەڵاس دابوو، وردە وردە کرانەوەو روون بوونەوە.

ئەم حاڵە بەردەوام بوو تا بانگی بەیانی فەرموو، ئەو گفتوگۆیە کاریگەرییەکی زۆری لێ کردبووم، یەکەمجارم بوو بێ بەزەییانە لە خۆم بپرسمەوەو بەخۆما بچمەوە. مێشکم جمەی دەهات لەو پرسیارانەی سەبارەت بە هۆکارو ئامانجی دروستبوونی خۆم هەمبوو. لە راستیدا پێکدادان و ناتەباییە ناوخۆییەکانی نێو کۆمیونیزم و ئەو کردارە دوور لە لۆجیکانەی تیایدا پەیرەو دەکران بەبەردەوامی بووبوونە سەرچاوەی گومان و پرسیار لام، بەڵام ئەم گفتوگۆیە بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر بناغەی باوەرمی لەقاندو خستیە لەرزە،

کۆمەڵێك ئاسۆی نوێ لەبەردەممدا کرانەوە، بەم کەف و کوڵ و جۆش و خرۆشەوە وەستاین بۆ نوێژ. یەکەم نوێـژم بـوو. ئـای خوایـەگیان! چەند حەزو لەزەتێکی بەتام بوو! تا نوێژەکە تەواوبوو دەگریـام. ئـەو حەقیقەتە ئیمانییانەی گوێبیستیان بـووم دەسـتیان خسـتە دڵمـەوەو چی پیسی و بێباوەڕی هەبوو لەبنەوە دەریانکێشا، ئـیتر هەوڵـدان بـۆ تۆژەنکردنەوەی تاوانکاری و کـارە ڕووخێنـەرەکانم بووبـووە خولیـای سەرم. ساڵی (١٩٨١) چووم بۆ ئەمریکا بۆ سەردانی کوڕەکـەم، لـەوێ تووشی ئیفلیجییەکی قورس هاتم، هەموو گیانمی گرتبۆوەو خرابوومـە ژێر چاودێری وردەوە لە نەخۆشخانەدا، ئا لـەو کاتـەدا خـەوێکم بینـی کە هێشتا لەژێر کاریگەرییەکەیدام: مامۆستا سەعیدی نوورسـی لەگـەڵ یـەکێکی تـردا تەشـریفیان هێنایـە ئـەو ژوورەوە کـە مـن تێیـدا نووستبووم، کـە جـەنابیانم بینـی بـۆ دەربڕینـی حـاڵی ناچـیزی خـۆم دەستم کردە گریـان، لـێم نزیـك بـۆوەو بـە زەردەخەنـەوە وتـی: "تـۆ ئەوەنـدە گوناهـت هـەبوو ئـەم ئەمریکایـە نەیـدەگرت و لێـی دەڕژایـە دەریاکانـەوە، پەیامـەکانی نـوور بوونـە کـەفیلی ژیانـت و ئـەم نەخۆشییەشت بۆیە پێ دراوە تا ببێتە کەفارەتی گوناهـەکانت، ئـارام بگرەو شوکرانەبژێر بە." ئـاوڕی دایـەوە بـۆ ئـەو زاتـەی لـە پشـتیەوە بەڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە وەستابوو و فەرمووی:

- وا نییە مەولانا خالید؟

- وایە مامۆستام.

به هەیەجانی ئەو خەوەوە بەئاگا هاتم و بینیم ژیـان گەڕاوەتـەوە بۆ نیوەی جەستەم.

ئێستا چەند مانگێکە هاتوومەتـەوە نیشتیمان، تاکە دڵنـەواییم لەهەمبـەر ئـەم نەخۆشـییە تاقـەت پـڕووکێن و قورسـەدا تـەنها پەیامـەکانی نـووره، خـۆم نـاتوانم بیخوێنمـەوە، کوڕەزاکـەم دەیخوێنێتەوەو منیش لەسەر کاسێت تۆماریان دەکەم، تا ئێواره بـه حەز و شـەوقێکی زۆرەوە گوێیـان بـۆ دەگـرم. کـه ئـەو ڕوونکردنـەوه ناوازەو بەڵگەکانی یەکتاپەرستی ناو پەیامی "بینینەکانی گەشتیارێك بـەناو گەردوونـدا" دەبیسـتم، ئەوەنـدە تێکـەڵاویان دەبم و ڕۆدەچـم تیایدا ئیتر پێویستیم نه به حەبی ئازارشکێن و نـه بـه دەرزی مـۆرفین هەیه تا ئازاره بەسوێکانم لـەبیر بەرێتەوە."پـەیامی حەشـر"یش وەك منـداڵێك دەمگریێنێـت، کەچـی جـاران گوللـه بچـوایه بـه قاچـمدا نەمـدەگوت ئـۆف. هـەرگیز ئـەو ڕابـردووە چـڵکن و بـەریادەم لـەیاد ناچێت، هەرگیز ئەو ترسه جێم ناهێڵێت که لەکاتێکدا سزای تاوانی بێ باوەڕیی بۆ ماوەی چرکەیەك ئەوەندە زۆر و بـێ ئەنـدازە بێـت، داخـۆ سەرتاپای ژیانێکی چل پەنجا ساڵی دەبێ سزاکەی چۆن بێـت. ئەمـه دەمهێنێتـه لەرزە،ئـەم تەمەنـەی لێوانـه لـه تـاوان و هـیچ یاسـایەکی مرۆیـی ناتوانێـت سـزای شـایانی خـۆی بـداتێ، داخـوازی بـوونی دۆزەخێکی هەمیشەییە، بـەڵام هانـا بـەرەو دەرگـای میهرەبـانی ئـەو خاوەن توانسته دەبەم و داوای لێخۆشـبوون تێکـەڵاوی فرمێسـکەکانم

دەکەم و پێشکەشی دەکەم، دەزانم ئەو ئەوەندە دلۆڤانە هەرگیز دەستە بەرزەوەبووەکان بۆ لای و لێوە جووڵاوەکان لەپێناوی ئەوداو پەشیمانیی ئەوانەی گەڕاونەتەوە، نائومێد ناکات. ئەمەش دڵم خۆش دەکات. مرۆڤ لەکاتێکدا نەخۆش و دەستەوسان و لاواز بێت و گەیشتبێتە کۆتایی تەمەنی، تەنها هێزێك دەتوانێ دڵنەوایی بداتەوە کە دەستەڵاتی بەسەر نەخۆشی و لاوازی و مردندا بشکێت. ئەگینا نە پارەو نە ماڵ و نە منداڵ ناتوانن ببنە جێی هیواو ئومێد. نەك هەر نابنە دڵدەرەوە، بەڵکو ئەو ئازارەی لە هەستکردن بە جوودایی ئەوانەوە پەیدا دەبێت، لە هەزار ئیفلیجی ناخۆشترە، پێویستە من ببمە نموونەیەکی بەرجەستە بۆ ئێوە چونکە من لەم ڕاستیەدا ژیاوم.

براکەم، وەکو کەسێك کە گەیشتوومەتە لوتکەی ملنەدان و بێ باوەڕی، دەڵێم: ئەم شەپۆلی سەرپێچی و تاوانکارییەی ئەم ڕۆژگارە کە لە مێژوودا وێنەی نەبووە، بەم ڕووخاندن و کاولکارییانەی کە دەیکات، دژی هەموو دینەکان و مرۆڤایەتی وەستاوەتەوە و گەیشتۆتە ئاستێك گەردوون بەرگەی ناگرێت و مووچڕکە بە جەستەیدا دێت، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم ئافەتەی کە پارەی بێ شومارو پلان و تەڵەکەی جۆراوجۆری بۆ دابین دەکرێت، پێویستیمان بە "پەیامەکانی نوور" هەیە کە ڕاڤەیەکی مۆدێرن و سەردەمانەی قورئانی پیرۆزەو ڕەچەتەیە بۆ لاشەی بیماری مرۆڤایەتی، هیچ چارەیەکی ترمان لەبەردەمدا نیە. من ئەمەم ئەزموون کردووە، هەر

لایەنێك بیەوێت مافی نیشتیمان و مرۆڤایەتی و بەڵکو گەردوون بەگشتی بپارێزێت، دەبێت یەکەم کار کە پێی هەڵدەستێت هەوڵدان بێت بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور. ئەگینا گەردوون بەرگەی ئەم ستەمە ناگرێت، ئیتر ئەم باسە ڕەوانەی ئەوانە دەکەم کە خاوەن ویژدان و دڵسۆزیین. چاوەڕێی نزاکانتانم و چاوتان ماچ دەکەم.

١٩٨٣/١٠/١٦

ساڵح گۆك كایا

ئیزمیر

## نامەی دووەم:

نامەیەکم نارد بۆ ناونیشانی ئەمریکای کاك سالح. وەڵامی نامەکەم لە ساڵی(١٩٨٥) پێگەیشت. لەکاتێکدا لەساڵی (١٩٨٤)نووسرابوو.

نامەکە کاك سالح خۆی نووسیبووی بەڵام کوڕەکەی ناردبووی، لەناویدا تێبینییەکی بچووکی تێدابوو کە کوڕەکەی نووسیبووی:

"دوو ڕۆژ دوای وەفاتی باوکم چوومە ژووره تایبەتییەکەی خۆیەوە، لەسەر مێزەکە نامەیەکی لێبوو کە ناونیشانی ئێوەی لەسەر نووسرابوو و ئامادەبوو بۆ ناردن، باوکی ڕەحمەتیم نامەکەی نووسیبوو بەڵام مەرگ ڕێی نەدا بۆتانی بنێرێ. ئەم نامەیە وەکو وەسیەتێکی باوکم بۆ ئێوەی دەنێرم، باوکی بەڕێزم بەیارمەتی موسوڵمانانی ئێرە بەڕێ خرا بۆ نیشتیمانی هەمیشەیی خۆی."

لەژێر نامەکەدا لەبری واژۆ نووسرابوو "کوڕی کاك سالح".

وەفاتی کاك سالح چەندە دڵگرانی کردین، نامەی دووهەمی ئەوەندە دڵی خۆش کردین، ئەم نامەیەی کە چەند جارێك خوێندمەوە، وەکو نامەی یەکەم بەهەموو ئەم نیشتیمانەدا بڵاوبۆوەو دەماودەمی پێ کرا.

ئەمەش دەقی نامەکەیە:

ئەی ئەو برا خۆشەویستەی گەرچی بە ماددە و جەستە لێم دووریت، بەڵام لە جیهانی مەعنەویدا زۆر لێم نزیکیت، لە نامەی

پێشووتدا هەستم کرد زۆر مەراقی بارودۆخی منتە. برام، زۆر حەیفە هێزی مەراق (واتە حەزی فێربوون)ی خۆت لەکاروباری کەسێکی گوناهبـاری وەك منـدا بەفیڕۆ بدەیت، چونکە شتێکی ژیرانە نیە لەکاتێکدا جەوهەرێکی بەنرخی وەك ئیمان وەستاوە، تۆ بێیت و ئەم مەراقەت لە چەند شتێکی بێ مانای وادا بەکاربهێنیت.

براکەم ئێستا حاڵی مادییم زۆر پەرێشانە. نەك هەستانە سەرپێ، بەڵکو هێزی قسەکردنیشم نەماوە لەکاتێکدا ئەم چەند دێرە ڕەش دەکەمەوە، وەك منداڵێك خۆم دەبینم کە لە سینەی گەرمی دایکی دابڕابێت. ئەم حاڵەی لاوازی و دەستەوسانییەم، یادگارییەکی کۆنمی بیرخستمەوە کە مەحاڵە لەیادم بچێت.

من یەکێك بووم لەو گەنجانەی کە لەسەر خواستی مارشاڵ تیتۆی سەرۆك وەزیرانی یوگسلاڤیا، بانگێشتی بەلگراد کرابووین. بیستمان ڕابەرێکی تر کە تەمەنی هەشتاوسێ ساڵەو زیاد لە حەفتا ساڵی ژیانی فیداکارانە لەپێناوی کۆمیونیزم لە یوگسلاڤیادا بەختکردووە، زۆر نەخۆشەو لە جێگادایە. پێشتر ناو و سەرلەبەری ژیان و هەموو ئەو کارو چالاکییانەی ئەومان وەك ناوی خۆمان لەبەربوو و زۆر سەرسام بووین بە کەسایەتییەکەی. بەفرسەتمان زانی و خێرا خۆمان گەیاندە ماڵەکەی، چەند کەسێکی تریشم لەگەڵدابوو کە لە وڵاتانی ترەوە هاتبوون و سەرۆکی ڕێکخراو و ڕێکخستنەکانی قوتابی یانی کۆمیونیزم بوون لە وڵاتەکانی خۆیاندا. کە چووینە ژوورەوە بینیمان دیوارەکان

پڕبوونەتەوە بەو مەدالیا و بەڵگەنامەی شەرەف و ڕێزلێنانانەی کە لەپاداشتی سەرکەوتنیدا لە مەیدانی کۆمیونیزمی جیهانیدا پێی بەخشرابوو. ئەم پیاوەی کە بە یەکێك لەو دە پازدە کەسایەتییە کاریگەرانەی جیهانی کۆمیونیزم دادەنرا، نووسابوو بە جێگاکەیەوەو نرکە و نالەی دەهات. ئێمە هێشتا لەناو ئەو خۆشییەدا دەژیاین کە ئەو شەرەفەمان پێ بەخشراوە ئەم پیاوە مەزنە ببینین، بەزەحمەت توانی ڕاست بێتەوەو دانیشێت. خزمەتکارەکان وەك پەروانە بەدەوروبەریدا هەڵدەسووڕان، دەتوت ئازارو ناڕەحەتی یەکانی ئەو هەموو ساڵە لە خەت و چرچەکانی ڕووخساریدا نووسراونەتەوە. ئەو دەم و چەناگەیەی وتاری بۆ هەزارەها کەس دابوو، ئەمڕۆ بووبوو بە تەڵەی تەقیو، دەست و قاچی تەنها ئێسقانەکانی مابوونەوە،چونکە ئێمە ئینگلیزییەکی باشمان دەزانی، بەئاسانی دەمانتوانی لەگەڵی بدوێین. بۆ ساتێك نیگام ئاوێتەی نیگاکانی ئەم گەورە مارکسیستە بوو، چاوانی پڕبوون لە فرمێسك و لێوی دەلەرزی، دەم و چاوی ئەوەندە خەمگین بوو دەتوت لەتاو ئازاری دابڕان و جوودایی لە ژیان دەتلێتەوە، کە هەستم بەمەکرد ویستم دڵی بدەمەوە:

"مامۆستا گیان ژیانی ئێوە پیت بە پیتی لە لاپەڕە زێڕینەکانی کۆمیونیزمدا نووسراوەتەوە. هیچ هەڤاڵێك نیە کارەکانی ئێوە بەرز نەنرخێنێت و چەپڵەتان بۆ لێ نەدات، هەموومان حەیران و سەرسامی جەنابتانین. وەك پەرستراوێك ڕێزتان لێ دەگیرێت، بۆچی مردن

ئەوەنــدە دەتانترســێنێت؟ گەرچــی لەوانەیــە بــە جەســتە لــەناومانا نەمێنیت، بەڵام لەنێو شـاکارەکانتدا دەژیـت." کـە وشـەی "مـردن"ی بیسـت، وەك ئـەوەی بوومەلەرزەیـەك بیهـەژێنێت، لـەرز دایگـرت، بـۆ ساتێك ڕووی ترش بوو و لۆچ کەوتە نێوچاوانی و هەناسەکانی خێراتـر بـوون، ئـەو قسـانەی کـە بـە دەنگێکـی لـەرزۆك و گریانـاوی وتنــی، ئێستاش لە گوێمدا دەزرنگێنەوە:

"هاوڕێ، من ئیتر دەمرم، ناتوانم ڕادەی ترسناکی مەرگ بۆ ئێـوە باس بکەم، گەر بشتوانم سەرکەوتوویم لە باسکردنیدا، هەرگیز ئێـوەی گەنج و لەش ساغ لەم تەمەنەتاندا لێم تێناگەن. بیرکەوە، مـردن یـانی نەبوون و بوون بە خۆڵ، ڕۆیشتنێکە کە جارێکی تر گەڕانـەوەی لـەدوا نیــە، ئەمــە خەریکــە شــێتم دەکــات. جیابوونــەوە لــە دۆســتان و خۆشەویستان و ناوبانگ و دەسەڵات... تێناگەیت چەند سامناکە؟

من ئێستا هەموو چرکەیەکم مردنێکە، مەرگ ئەوەنـدە ترسـێنەرو زەندەقبەرە، هەموو ساتێك لە ژەهر ڕشتنی خۆی بەردەوامە.

هاوڕێیان،دەمەوێت بە دڵێکی فراوانـەوە لەبەرچـاوی ئێـوەدا ئـەم دانپێدانانە بدرکێنم: ئەگەر دوای مردن زیندووبوونەوەو پاداشت و سزا نەبێت و ببمە خۆڵ، ئەی کەواتە نرخ و مانای ئەم هـەوڵ و تەقەلایـەی من چییە کە داومە؟ پێم بڵێن؟ لە دڵی هەڤاڵانا دەنێژرێم و چەپڵەم بۆ لێ دەدرێت، ئەمانە بە من چی؟ دوای ئـەوەی تیادەچـم، ئایـا دەنگـی چەپڵە و ڕێزلێنانی ئەوانەی دوای من، ویژدانی ئـەو مـار و دووپشـکانە

دەبزوێنێت کە بەردەبنە جەستەی بێ گیانم؟ پێم بڵێن، ئەم ڕۆیشتنەی ئێمە بەرەو کوێ یە؟ مارکس و ئەنجلس و لینین نەیانتوانی ئەمە ڕاڤە بکەن. ناچارم دان بەوەدا بنێم کە: من ئیتر باوەڕم بە خواو پێغەمبەرو زیندووبوونەوە هەیە. بێ دینی چارەیەك نیە. بیرکەنەوە، ئەم گەردوونە ناوازەیەو ئەم کۆشکە مەزنە پێویستە بەدیهێنەرێکی هەبێت، بەڕای من ناگونجێت مردن کۆتایی ڕێگەکە بێت. پێویستە شوێنێك هەبێت تێیدا چاکەکاران پاداشت بکرێن و بەدکاران بە سزای خۆیان بگەن، چونکە ئەوەتا بە بەرچاوی خۆمانەوە دەبینین ستەمکارو ستەم لێکراو وەکو یەك لەم دنیایە کۆچ دەکەن، ئەم کێشمەکێشە نابێت هەر ئاوا کۆتایی بێت. من بە ویژدان هەست بەمە دەکەم، بەجۆرێك ئەو ستەم و زۆرەی لە ملیۆنەها مرۆڤمان کردووە، ئێستا دەستی لە بینم گیرکردووە، دەبێت یەکێك هەبێت گوێ بۆ دادو فەریادی ئەمانە رابگرێت. گەر وانەبێت مرۆڤ بەچی سووکنایی دێتێ؟ پێویستە ئەمانە ڕوونکردنەوەیەکیان هەبێت. مارکس لەمەدا هەڵەی کردووەو مێشکی ئێمەشی سەرخۆش کرد، بەجۆرێك هەتا مردن لەدەرگامان نەدات هەست بەمە ناکەین. لەوانەشە پلەوپایە بریقەدارەکان ڕێگربن لەبەردەم بینینیدا، من لەسەر ئەم بیرو باوەڕەم هەڤاڵان، ئێوە چی دەڵێن بیڵێن." لەدوای ئەم چەند دێرە خەمگینە، دەمەوێت هەواڵێکی خۆشتان پێ بدەم: کە لە نەخۆشخانە کەوتبووم، سەرۆکی ڕێکخراوی ئاتەیست(بێ دین)ەکان هات بۆ سەردانم،

پرۆفیسۆر بوو لە فەلسەفەدا. یەکێك بوو لە ئەندامانی بەڕێوەبەری زانکۆی کالیفۆڕنیا. لێم پرسی کە ئامانجی ئەم ڕێکخراوەی ئێوە چیە؟ لە وەڵامدا وتی:"هەموو دینەکان بە پەردەیەکی ئەستوور مرۆڤایەتیان داپۆشیوەو چەند یاسایەکی وشك و قورسیان داناوەو بەربەستن لەبەردەم چێژبردن و لەزەت بینینی تەواوەتی توێژی لاوان لە خۆشی و ڕابواردنەکانی ژیان، ئێمە پێیان دەڵێین کە خوا نیە بۆئەوەی بێ ترس و دڵەڕاوکێ بتوانن چێژەکانی دونیا تام بکەن."

دەمزانی ئەم ڕێکخراوەی کە لە ئەمریکادایە، پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ مۆسکۆ هەیە، چونکە ڕوسیا لەبەرئەوەی نەیتوانیوە بەو شێوەیەی کە دەیەوێت کۆمیونیزم لە ئەمریکادا بڵاوبکاتەوە، بانگەشەی بێ دینی و بێ خوایی و بێ بەرنامەیی دەکات تا لەڕێی ئەمەوە لاوان دووچاری بەرەڵایی و بێ ئامانجی بکات، لەڕاستیدا ئەم ڕێکخراوە داردەست و ئەڵقەلەگوێی مۆسکۆیە. لەبەرامبەر ئەو قسەیەی پرۆفیسۆرەکەدا منیش چەندم پێکرا، هەوڵمدا باسی سێهەمی "پەیامی بەری درەختی ئیمان"ی بۆ ڕوون بکەمەوە.زۆر بەجددی گوێی بۆ گرتم، کاتێك ئەم ڕاستیە ئیمانیانە تا ڕادەیەك دەرگای لەمێژە داخراوی بێ باوەڕی دڵی ئەوی کردەوە، پەیتا پەیتا هەموو ئەو پرسیارانەی ڕیزکرد کە دەمێکە لەناخیدا پەنگیان خواردۆتەوەو ئەم سەرکوتی کردوون. هەرچەند کاتەکە زۆر نەگونجاو و کورت بوو و منیش زۆر نەخۆش بووم و نەمدەتوانی وەك پێویست وەڵام بدەمەوە،

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کاکی پرۆفیسۆر لەبەرامبەر ڕاستییەکانی ئیماندا شل بووبوو. بە ئومێدی دیدارێکی تر ماڵئاواییمان لەیەکتر کرد، کە ڕۆیشت بیلبیلەی چاوەکانی پێدەکەنین. زۆر سوپاس بۆ خوا کە دووهەم جار یەکترمان بینییەوە، لە کۆتایی گفتوگۆیەکی دوور و درێژدا پەنجەی شایەتومانی بەرزکردەوەو بەچاوی پڕ ئەسرینەوە وەك ئەوەی تەحەددای هەموو جیهانی بێباوەڕی بکات، موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، نیوەشەو ڕۆیشت و بەڵێنی دا کە بەیانی زوو بێت تا نوێژی فێربکەم.

خواخوام بوو چرکەیەك زووتر بەیانی بێت، چاوەکانم چەند کاتژمێرێك چاوەڕێی ئەوەبوو ئەو دەرگاکە بکاتەوەو بێتە ژوورەوە. بەداخەوە نیوەڕۆ هات و ئەو هەر دیار نەبوو. تەلەفونم کرد بۆ ماڵەوەیان. دەنگێکی نەناسراو وەڵامی دامەوە، وتم:

- پرۆفیسۆر خۆی لە کوێ یە؟
- تۆ کاك سالحیت؟
- بەڵێ.
- شەو نۆرەی دڵ لێیداو مرد، لە سەرەمەرگدا هەر ناوی تۆی دەهێنا. من کوڕی ئەوم، دوو کاتژمێر پێش مردنی هەمووانی کۆکردەوە. دوای ڕوونکردنەوەیەکی زۆر داوای لێ کردین کە ئێمەش موسوڵمان ببین، من و دایکم و خوشکەکەم قسەکانی باوکمان بە گونجاو زانی و موسوڵمان بووین. بڕیاربوو هەموومان پێکەوە بێین بۆ

لای تۆ تا نوێژمان فێربکەیت، واقم وڕما. خوایە گیان دەمەوێت لەبەرامبەر گەورەیی و مەزنیی تۆدا سەر بنێمە سەر زەوی و جارێکی تر بەرزی نەکەمەوە، چونکە تۆ گەوهەرێکی وەك قورئانت پێ بەخشیوین، کە تەمەنێکی لێوان لێو لە ستەم و تاریکی بەچەند کازێرێك ڕووناك دەکاتەوەو دەیکات بە چراخان. چەند نیعمەتێکی نەبڕاوەیە خوایە گیان! چەند خەزێنەیەکی بێ پایانە! ئەگەر بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکانی لەشمان لەپێناو تۆدا ببینە قوربانی، هێشتا شایانی گەورەیی تۆ نییە.. هاوڕێی ئازیزم، شوکرانەبژێری هەموو ئەم نیعمەتانەم و چۆن ئەویندارێك چاوەڕوانی ڕۆژی ژوان و ویسالّی یارەو تا ئەو ڕۆژە حەسرەت پارچە پارچە دەیتوێنێتەوە، منیش ئاوا تامەزرۆی بینین و بەخزمەت گەیشتنی پێغەمبەری ئازیز و باوەڕدارانم. چاوەڕێی ئەو ساتەم. چاوەڕێی فریشتەی مەرگ ئەکەم بێت و دەرگای ژوورەکەم بکاتەوە، تەنها پەردەیەکی تەنك ماوە لە نێوان من و مردندا. کفن و سابوونەکەم لەژێر سەرمدا ئامادەیە. خوای گەورە لە قوتابیانی قورئان قبووڵمان بکات کاتێك دوا هەناسە دەدەینەوە.چاوەڕێی دوعاتانم.

١٩٨٤/١٢/١٢

سالّح گۆك کایا

هەر کە هەواڵی وەفاتی کاك ساڵحم پێگەیشت، دەست و برد بە تەلەگرافێك سەرەخۆشی خۆم بە بنەماڵەکەی گەیاندو پێم ڕاگەیاندن کە ئێمە لێرە زۆر دڵگرانین بە کۆچی دوایی کاك ساڵح و هاوبەشی خەمتانین، نامەیەکم بۆ کوڕەکەی نووسیبوو.

دووپاتم کردبۆوە کە بەهەر نرخێك بووە دەمەوێت یەکتر بناسین و ئەو دۆستایەتیەی کە لەگەڵ باوکیدا هەمبووە، ئێستا ئارەزوو دەکەم لەگەڵ کوڕەکەیدا بەردەوام بێت، نووسیبووم کە هەندێك لایەن و کۆشەی نادیار لە ژیانی باوکیدا هەیە کە پێویست و گرنگە ڕوون ببنەوەو بۆ ئەم مەبەستەش لە کوڕەکەی باشترم دەست ناکەوێت، داوام کردبوو کە بەزووترین کات وەڵامم بداتەوە.

دوای دوو مانگ نامەیەکم لە کوڕەکەیەوە بەدەست گەیشت:

"زۆر سوپاست دەکەین کە هاوبەشی خەمی ئێمەیت لەم کۆسپەی بەسەرماندا هاتووە. بێ گومان دۆستی باوکم، دۆستی منیشە، بەڵام لەبەرئەوەی زوو زوو ئادرێسەکەم دەگۆڕم، ناتوانم پەیوەندییەکی بەردەوام لەگەڵ بەڕێزتان ببەستم. هیوادارم لێم تێبگەن. زۆر سوپاس..." زۆر نامەی ترم نارد بۆ کوڕەکەی، بەڵام هیچم پێ نەگەیشت، ئێستاش چاوەڕێی وەڵامێکم لە کوڕەکەیەوە، هێشتا ئەو ئومێدەم هەیە کە ئەگەر بێت و ئەم مرۆڤە نائاساییە

یادگارییە ڕەشەکانی بکەونە بەر ڕۆشنایی لەوانەیە زۆر سەرەداوو شتی گرنگ بەدەستەوە بدەن.

گیانی کاک ساڵح شاد بێت. خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش بێت هەموو ئەو کاک ساڵحانەی تر کە لە کۆلآنی دەرنەچووی بێ باوەڕیدا گیریان خواردووەو پەلەقاژەیانە، بگەیەنێت بە هەمان ڕێنموونی و ڕووناکی. دنیای ئەنگوستەچاویان نوور داپۆشێت...

ئامین، ئامین، ئامین!

# پێڕست

# KENDİNİ ARAYAN ADAM

## HALİT ERTUĞRUL

لـه ڕۆژگارێکـی کورتـی پایـزدا.. بەهەنگاوێکـی قورسـەوە لـە (قەیسـەرییە)وە سـواری پـاس بوو، هەگبـەی خەیاڵی دەستەوسـانە بـەو ئایدیۆلۆژیایـەوە کە شەسـت سـاڵی تەمەنی کردۆتـە قوربانی.. لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆر بـە قورسـی کەوتـە ژێـر کاریگەریـی قسـەی مامۆستایەك کە لەو پاسەدا هاوسەفەری بوو!

ئـەو چوزانێت گفتوگـۆی لەگـەڵ ڕێبوارێکدا لە نێو پاسـێکدا ژیانی ئـەم لـە ڕیشـەوە دەگۆڕێـت؟! بەڵـێ.. گفتوگۆکەیـان تـا بەیانـی بـەردەوام بـوو، لـە کۆتادا خـۆی و ئایدیاکـەی کەوتنە بەر لێشـاوێك لە پرسیاری نوێی بیر و هۆشی خۆی!

لێـرەدا لەخۆمـان دەپرسـین: دەبـێ ئـەو بابەتانە چـی بـن ئەوەندە بە هێـزەوە کاریگەرییـان لـە ناخـی مرۆڤێـك هەبێـت، یاخـود دەبـێ کۆتایی ئەم چیرۆکە سەرنجڕاکێشە بەچی گەیشتبێت؟!

ئەم پەرتووکەی مامۆستا (خالید ئێرتوغروڵ) تیراژ و نۆبەی چاپەکانی سنووری ئاسایی تێپەڕاندوە و وەرگێڕدراوەتە سەر حەوت زمانی بیانی، بە خوێندنەوەی ئاسۆیەکی نوێ لە بیر و ژیانتاندا واڵا دەکات.


ISBN 0-0001-0000-5



9 780000 100009

نرخی (٣٠٠٠) دینارە



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA Media Center

www.aramediacenter.com

info@aramediacenter.com


